# گەشتێك

# بە كرۆكی ڕێزمانی كوردیدا



پرۆفیسۆر

د. شێركۆ بـــابـــان

كۆلێژی ئەندازیاری زانكۆی سەلاحەدین- هەولێر

هەولێر ٢٠١٦

# گەشتێك

# بە كرۆكی رێزمانی كوردیدا

پرۆفیسۆر

د. شێركۆ بـــابـان

كۆلێژی ئەندازیاری زانكۆی سەلاحەدین- هەولێر

هەولێر ٢٠١٦

- ناوی کتێب:

**گەشتێك بە كرۆكی رێزمانی كوردیدا**

- ناوی نووسەر: پ. د. شـــێركۆ بـــابـــان
- بابەت: رێزمانی كوردی
- تیراژی ( ٣٠٠) دانە
- دیزاین: دەزگای گۆڤار بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە (ماهر موعین مستەفا)
- چاپی یەكەم / ٢٠١٦
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی (٦٤٦) ساڵی ٢٠١٦

ی پێدراوە.

## لیستی هێماكان

| | |
|---|---|
| فۆنیمی (نەبزوێن) | C |
| هێمای فۆنیم | /-/ |
| وچانی دەنگسازی، سنووری بڕگەیی | \| |
| كرۆكی بڕگە (جووتەدەنگ) | \|C^V\| |
| نیمچەبڕگە لە گیرفانی نووك (گ ن)دا، لە بڕگەی لێكدراودا | c. |
| بڕگەی گرانی لێكدراو | c.CVcc |
| بڕگەی پڕی لێكدراو | c.CVc |
| بڕگەی سووكی لێكدراو | c.CVo |
| هێشووی نەبزوێن لە گیرفانی دامێن (گ د)دا | -cc |
| بڕگەی گران | CVcc |
| بڕگەی پڕ | CVc |
| بڕگەی سووك | CVo |
| هێمای نەبزوێنی سەرەكی نادیار (C) لە بڕگەی ناتەواودا | Q |
| بڕگەی گرانی ناتەواو | QVcc |
| بڕگەی پڕی ناتەواو | QVc |
| بڕگەی سووكی ناتەواو | QVo |
| فۆنیمی (بزوێن) | V |

## هێماكان و زاراوەكان

(خ ب) خانەی (بزوێن) لە چێوەی بڕگەدا, وەك جێگەی بزوێنی /ا/ لە بڕگەی |بزار|دا

(خ ن) خانەی (نەبزوێن) لە چێوەی بڕگەدا, وەك جێگەی نەبزوێنی /ژ/ لە بڕگەی |بژار|دا

(گ د) گیرفانی دامێن, وەك جێگەی نەبزوێنی /ر/ لە بڕگەی |بژار|دا

(گ ن) گیرفانی نووك, وەك جێگەی نەبزوێنی /ب/ لە بڕگەی |بژار|دا

**بڕگەی ئاسایی** ئەو بڕگەیەی كە گیرفانی نووكی (گ ن) بەبێ بارگەیە, وەك (دە|cvo, دەر|cvc, دەست|cvcc)

**بڕگەی پڕی ئاسایی** ئەو بڕگەیەی كە لە بزوێنی سەرەكی و نەبزوێنی سەرەكی پێكهاتوە, بەڵام نەبزوێنێكی پەراوێزی هەڵ گرتوە لە گیرفانی دامێن (گ د)دا, وەك (دەر|cvc)

**بڕگەی پڕی لێكدراو** ئەو بڕگە پڕەیە كە نەبزوێنێكی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووك (گ ن)دا, بە فۆرمی نیمچەبڕگە (.c), وەك (بژار|c.cvc)

**بڕگەی پڕی ناتەواو** ئەو بڕگە پڕەیە كە نەبزوێنی سەرەكی تێدا نیە و دەبێت بۆی پەیدا بكرێت, وەك پاشگری (ـەر|Qvc)

**بڕگەی سووكی ئاسایی** یان (جووتەدەنگ), واتە ئەو بڕگەیەی كە هەر لە بزوێنی سەرەكی و نەبزوێنی سەرەكی پێكهاتوە, وەك (دە|cvo)

**بڕگەی سووكی لێكدراو** ئەو بڕگە سووكەیە كە نەبزوێنێكی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووك (گ ن)دا, بە فۆرمی نیمچەبڕگە (.c), وەك (برا|c.cvo)

**بڕگەی سووكی ناتەواو** ئەو بڕگە سووكەیە كە هەر یەك بزوێنی سەرەكی پێك هاتوە و داوای نەبزوێنی سەرەكی دەكات, وەك هەر بزوێنێك بە تەنها (بزوێن|Qvo)

**بڕگەی گرانی ئاسایی** ئەو بڕگەیەی كە لە بزوێنی سەرەكی و نەبزوێنی سەرەكی پێكهاتوە, بەڵام دوو نەبزوێنی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی دامێندا,

**بڕگەی گرانی لێكدراو** ئەو بڕگە گرانەیە كە نەبزوێنێكی پەراوێزی هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووكدا بە فۆرمی نیمچەبڕگە (.c), وەك (بنێشت|c.cvcc)

**بڕگەی گرانی ناتەواو** ئەو بڕگە گرانەیە كە نەبزوێنی سەرەكی تێدا نیە و دەبێت بۆی پەیدا بكرێت, وەك پاشگری (اند|QVcc)

**بڕگەی لێكتراو** ئەو بڕگەیەیە كە نیمچەبڕگەیەك هەڵ دەگرێت لە گیرفانی نووك (گ ن)دا, وەك (فرۆ|c.CVo, بژار|c.CVc, بنێشت|c.CVcc)

**بڕگەی ناتەواو** ئەو بڕگەیەیە كە بزوێنی سەرەكی تێدا هەیە بەڵام نەبزوێنی سەرەكی تێدا نیە, وەك (هەر بزوێنێك|QVo, پاشگری ـەر|QVc, پاشگری اند|QVcc)

**بزرۆكە (بزوێن)** بزوێنێكی سرك و جینگزە, لە هەر جێیەكدا كە (نەبزوێن)یك لە تەنگژەدا بێت, پەیدا دەبێت و جووتەدەنگی بۆ دەرەخسێنێت. هەركە تەنگژەكەیش نەما, وندا دەبێتەوە.

**بزوێنی سەرەكی (V)** ئەو بزوێنەیە كە سەری لكاوە بە كلكی نەبزوێنەوە و گشت دەنگە بزوێنەكان بریتین لە بزوێنی سەرەكی.

**توانستی بزوێن** زەبری و بڕشتی بزوێن لە بنیادنانی بڕگەدا, یان Vowel Power

**پەراوێزی بڕگە** هەردوو گیرفانەكەی بڕگە (گ د) و (گ ن)

**چەمسەر** (سەر) یان (كلك)ی فۆنیم

**جووتەدەنگ |C^V|** (گرێی دەنگسازی), یان كرۆكی بڕگە. جووتەدەنگ بە ڕاستەوخۆیی یەكسانە بە (بڕگەی سووكی ئاسایی)

**خانەی بزوێن (خ ب)** خانەی دوایی لە چێوەی بڕگەدا, كە مۆڵكی بزوێنی سەرەكیە, بێگومان سەری ئەو بزوێنە لكاوە بە كلكی نەبزوێنی سەرەكیەوە

**خانەی نەبزوێن (خ ن)** خانەی بەرایی لە چێوەی بڕگەدا, كە تەرخانكراوە بۆ نەبزوێنی سەرەكی, یان ئەو نەبزوێنەی كە سەری لكاوە بە سەری بزوێنەوە

**خلیسكەبزوێن** یان (نیمچەبزوێن), ئەو دەنگە گلانیەیە, كە بە مەرجی (خشان لە كلكی نەبزوێن) دەبێت بە (بەبزوێن), ئەگەرنا بە پێناسەی (نەبزوێن) ڕەفتار دەكات لە ڕیزی ئاخاوتندا.

**دەنگی خەپ** ئەو دەنگە نەبزوێنە ڕەسەنەی نێو گیرفانی دامێن (گ د), كە تەنها بە زەبری بزوێن دەر دەكەوێتەوە, وەك دەنگی /ر/ لە نموونەی (بخەوە|ر|ە|وە)دا.

**زەبری بزوێن** توانست و وزەی بزوێن لە دامەزراندنی بنیادی ئەندازیاری بڕگەدا

| | |
|---|---|
| **گرێی دەنگسازی** | بڕوانە بۆ (جووتەدەنگ) |
| **گیرفانی دامێن (گ د)** | گیرفانی دوایی لە پەنای کلکی بزوێندا. |
| **گیرفانی نووك (گ ن)** | گیرفانی بەرایی لە بڕگەی لێکدراودا. |
| **کریستاڵی جووتەدەنگ** | گرێی جووتەدەنگ \|C^V\| |
| **ناوگر** | ئەو دەنگە نەبزوێنە نامۆیەی کە دەلکێت بە سەری بزوێنەوە. |
| **نەبزوێنی پەراوێزی (c)** | ئەو نەبزوێنانەی کە لە گیرفانی خانەکاندان, نەك لە خانەکاندا. |
| **نەبزوێنی سەرەکی (C)** | ئەو نەبزوێنەی کە کلکی لکاوە بە سەری بزوێنەوە. |
| **نیمچە بزوێن** | خلیسکەبزوێن, بڕوانە بۆ زاراوەی (خلیسکەبزوێن) لە پێشەوە |
| نیمچەبڕگە (.C) | بڕگەی بزوێنی بزرۆکە بە مەرجێك کە گیرفانی دامێنی (گ د) بۆش بێت, وەك دەنگی /[redacted]/ لە ئەم بڕگانەدا ([redacted]نار, [redacted]ڕۆ, [redacted]نێشت) |

# پێشەكی

وا دەیان ساڵە ئەم پرۆژە زانستیە لە بیری ئێمەدا زاوزێ دەكات و پەرە دەستێنێت و بیرۆچكەكان بە بەردەوامی لە گۆڕاندان. ئێمەیش كە دەچینە سەر خەتی توێژینەوەسازی، ناوەڕۆكە بابەتیەكە بە توندی دەگرین و توێكڵە دەرەكیەیش كەم و زۆر فەرامۆش دەكەین، تا لە پاشتردا پێداچوونەوەی بۆ بكەین. هەندێك جار، لە ئێرە و لە ئەوێ، هەندێك هەڵە دەردەكەون، رەنگە هۆی ئەوەیش ماندووبوون و بیرخەستكردنەوە بن، چونكە زۆر سەختە بۆ توێژەر كە تێكستێكی خۆی چاك بكاتەوە و جارێكی تر نەهێڵێت كە زوومی بیری بچێتەوە سەر خەتی توێژینەوەسازی و بیرگوشین. بەڵێ، وا نزیكەی (٤٠) ساڵە پابەندین بە ئەم ئەركە نیشتمانیەوە و تا ئێستا، بە ئەم كتێبەی بەردەستەوە، (٤٣) كتێب بوە بە زادەی بیری ئێمە و بوە بە رەنجی چلساڵەی ئێمە، چونكە بلاوكراونەتەوە و لە بەربەستی (نەمان) پەڕیونەتەوە. لە لایەكی ترەوە، هەندێك لە ڕێزماننووسانی ئێمە، ئەگەر نەڵێم زۆربەیان، لە بابەتە كرۆكیەكان و لە خەسڵەتەكانی ڕێزمانی كوردی نزیك نابنەوە، هەر دەڵێیت یەكەی توێژینەوە و پەرەسەندن لە بیری ئەواندا خامۆشە و لە خەو هەڵ نەساوە، چونكە هەر تشتە كۆنەكان دەجاونەوە و لاسایی (ئەم و ئەو) و (دەور و بەر) دەكەنەوە. لە ئیشەكانی ئێمەدا، هەر لە یەكەم نووكە پێنووسەوە، دەستپارێزیمان كردوە لە ئاستی زۆر كێشەی باو و بەسەردا تێپەڕیو، یان لە دژیان وەستاوین، تا بە بێئاگایی تۆمار نەكرێن لە زمانی نووسیندا. تەنانەت، لە بابەتی یەكەمی ئەم كتێبەی بەردەستدا، داكۆكی لە قەوارەی بزوێنی (بزرۆكە) دەكەین، كە گرافیمی بۆ تەرخان بكرێت، چونكە بزوێنی هەشتەمە لە لیستی بزوێنەكانی زمانی كوردیدا. هەروەها، ڕۆڵەكەی زۆر گرنگە، كە وەك بزوێنەكانی تر نیە، چونكە دوو ئەركی كرۆكی دەگێڕێت، ئەركی یەكەمیان ئەوەیە كە بزوێنێكی (ئامادە و لەسەرڕێ)یە بۆ فریاكەوتنی هەر (نەبزوێن)ێك كە لە سەر زمان لە تەنگژەی گۆكردندا بێت. بە راستی،

ئەگەر بزوێنی بزرۆكە هەرگیز (لەسەرپێ) نەبێت، ئەوا زمانی مرۆڤ لە چەندین جێدا لاڵ دەبێت، یان دەبێت بە (لاڵەپەتە). ئەركی دوەمیان ئەوەیە، كە وەك بزوێنەكانی تر، هەر خۆ بە خۆی بنیادی چەندین وشەی رۆناوە، وەك (درِ، درز، كرِ، فت، قژ، پرچ، ...)، چونكە تاكە بزوێنە لە بنیادی فۆنەتیكی ئەو وشە واتادارانەدا. لە لایەكی ترەوە، ئێمە زۆر ماندوو بووین بە بابەتەكانی نێو ئەم كتێبەوە، چی لە كاتی بلاَوكرنەوەدا و چی لە كاتی پێداچوونەوەدا (٢٠١٦)، چونكە كێشە سەوداكراوەكان زۆر كرۆكین و خزمەت بە ئەوەی دوارِۆژ دەكەن لە ناوەندە زانستیەكانی توێژینەوەی زمانەوانیدا. ئەمە و لە بەشی چوارەمدا، سیستمی زمانەكە بە (نیرگەیتیڤ) پێناسكراوە، كەچی رێزماننووسانی ئێمە، بێجگە لە (د. وریا عومەر ئەمین)، لە ئەم سیستمە بێخەبەرن و بە سیستمی (ئەكیووزەیتیڤ)ەوە خەریكن. هەر لە بەشی چوارەمدا زووم خراوەتە سەر پۆلێنكردنی زمانی كوردی و هەندێك لە خەسڵەكانی تایبەتیەكانی دەستنیشانكراوە، كە دەشێت زمانانی تریش كەڵكی لێ وەربگرن. لە بابەتی هەفتەمدا، بایەخدراوە بە پێشكاری (بـ)، ئەو مۆرفیمەی كە لە زمانی نووسیندا بە گشت لایەكدا پەرپووتكراوە، چونكە دوژمنێكی سەرسەختی هەیە و لە گشت جێیەكدا دەی توێنێتەوە و ونی دەكات لە بەرچاو (بە رێسا). ئەو دوژمنەیش بریتیە لە نیشانەی نەرێ (نە). تەنانەت، بە لاساییكردنەوە پێشكاری (نە)، پێشكارەكانی تریش پێی فێربوون و بە نارِێسا دەی توێننەوە و زمانی نووسینی پێ لەكەدار دەكەن. ئەمانە چەند نموونەیەك بوون لە بابەتەكانی نێو كتێبە، بەلاَم لە گشت بابەتەكانی تریشدا ئەو خاڵە كرۆكیانە هەن و بەرجەستەن.

# ناوەڕۆك

## بابەتی یەكەم

# بزوێنی بزرۆكە بە بەرجەستەیی لە نووسیندا[1]

**١/١: دەسپێك:**

لە ڕێنووسی زمانی كوردیدا، بـزوێنی (بزرۆكـە) گرافیمـی بـۆ تـەرخان نـەكراوە و ئەوەیش بوە بە یەكێك لـە كێشـەكانی نووسـینی كـوردی بـە پـیتی عـەرەبی. لـە ڕێنووسـی لاتینیدا، پیتی ئای بچووك (i) بەكار دەهێنرێت بۆ ئەو بزوێنە و لـە زۆر وشـەدا ڕێنـووس دەكرێت، چونكە نرخـی خـۆی هەیـە لـە خوێندنـەوە و لـە گۆكردنـدا. بەداخـەوە، زۆر لـە ڕێزماننووسـان وای بـۆ دەچـن كـە ئـەو دەنگـە، وەك لـە خۆیـەوە پەیـدا دەبێـت و وەك لـە خۆیەوە ون دەبێت، پێویستی بـە ئـەوە نیـە كـە گرافیمێكـی بـۆ تـەرخان بكرێت. لـە ئـەم نووسینەدا، جارێكی دی ڕوو دەكەینەوە لە ئاریشەی ئەو دەنگە بێنازە و تـێ دەكۆشـین كـە بی خەینە بەر ڕووناكی توێژینەوە، بەتایبەتی لەئەو گۆشە تاریكانەدا كـە ڕوونكردنـەوەی وردی پێویسـتە. ئێمـە لـە ئـەو بـاوەڕەداین كـە لـە پاشـەڕۆژدا ئـەو دەنگـە، وەك گشـت دەنگەكانی دی، دەبێـت بە خاوەنی ڕوخساری تایبـەتی خـۆی لـە ریـزی ئـەلفوبێی فـۆنیمی زمانەكەدا، بە تایبەتی لە ئەو جێیانـەدا، كـە ئـاڵوگۆڕ پەسـەند ناكـات و بـە بەرجەسـتەیی دەمێنێتەوە و (واتا)ی فۆرمی وشەیەك دەپارێزێت، وەك ئەم نموونانە: (پشـت، بسـت، درز، دز، پڕ، نك، ....). ئەمە و بە هیواین بتوانین خزمەتێكی زۆر بچووك پێشكەش بكەین بـە خوێنەر و بە توێژەری ئازیز.

[1] گۆڤاری (هزرین)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٥.

## ٢/١: پەیدابوونی بزوێنی بزرۆكە:

لە چەندین وشەدا، وەك (سارد، ئاست، گەنج، دۆست، چوست، مێرد، ...)، دوو دەنگە نەبزوێنەكەی كۆتایی بەبێ بزوێنی (بزرۆكە) لە یەك جووت دەبن. بۆ نموونە، لە وشەی (دۆست)دا دەنگی (سین) و دەنگی (تێ) پێكەوە گۆ دەكرێن، كەچی دەنگی (سین) و دەنگی (كاف) پێكەوە گۆ ناكرێن لە وشەی (كەسك)دا، چونكە بە ئاشكرایی بزوێنی (بزرۆكە) دەكەوێتە نێوان هەردوو دەنگەكە[٢]. بەرانبەر بەئەم دیاردەیە، كە لە نێوان (سین) و (تێ)دا بزوێنی (بزرۆكە) نیە، دەتوانین روو بكەین لە گۆ كردنی هەر دوو دەنگەكە پێكەوە, وەك (ست). لە ئەم بارەدا، دەنگی بزوێنی (بزرۆكە) لە هیچەوە پەیدا دەبێت. ئەمەو ئەو دوو دەنگە /س/ و /ت/ دوو باری شیاو پەسەند دەكەن، وەك:

**یەكەم:** ئەگەر لە گیرفانی دامێنی بڕگەدا (گ د) گۆ بكرێن، پێویست نابن بە بزوێنی بزرۆكە, وەك نموونەی (دۆست).

**دووەم:** ئەگەر لەسەرەتای وشەدا گۆ بكرێن، ئەوا بزوێنی بزرۆكە دەكەوێتە نێوانیان و دەیان كات بە بڕگەیەك و دەنگی /س/ لە خانەی نەبزوێندا و بزوێنی (بزرۆكە) لە خانەی بزوێندا بە ناچاری ئاكنجی دەبن. دەنگی /ت/یش لە گیرفانی دامێنی بڕگەكەدا (گ د) دەبێت بە دەنگێكی پەراوێزی, وەك گۆكراوی (سـِت).

بەم پێیە، بزوێنی بزرۆكە دەبێت بە (ناوگر)ێكی ئامادە و لەسەرڕێ بۆ ئەو دەنگە نەبزوێنانەی كە ناتوانن بە زاردا تی بپەڕن، بەبێ قەوارەی بڕگە. بەرانبەر بە ئەم ئاكارە خۆڕسكیە, گشت دەنگە نەبزوێنەكان یەكسانن، تەنانەت ئەگەر هەردوو دەنگەكە هەمان دەنگ بن، وەك جۆرە بڕگەی (تت، بب، نن، ...). كەواتە، قەوارەی بڕگەیەك لە چەشنی (بڕگەی بزوێنی بزرۆكە) لەبەر زاردا ئامادەیە بە (یەدەكی)، بۆ پەڕاندنەوەی:

[٢] لە وشەی (كەسك)دا، بزوێنی (بزرۆكە) هەرچەندە دەكەوێتە نێوان هەردوو دەنگەكە, بەلام دەلكێت بە كلكی (سین)ەكەوە بۆ نەوەی (جووتەدەنگ) بەرهەم بهێنێت. دەنگی (كاف)یش, وەك دەنگێكی پەراوێزی, لە گیرفانی دامێندا رۆ دەنیشێت.

(١): ئەو دوو دەنگە نەبزوێنەی كە بەبێ (بزوێن) دەگەنە بەر باجگەی گۆ كردن, وەك (ب ِت). بێگومان, لە سەر ئەم ریتم و ئاوازەیە زمانەكەمان دەوڵەمەندە بە وشەی وەك: (دژ, فش, گف, گل, تك, نك, لك, زگ, مل, كل, كر, گڕ, دز, سنگ, لنگ, ...).

(٢): ئەو دەنگە نەبزوێنە تاكەی كە بەبێ (بزوێن) دەگاتە بەر باجگەی گۆ كردن, وەك (ب ِـ), یان وەك هەمان دەنگ لە گیرفانی نووكی بڕگەی لێكدراودا, وەك ((ب ِنار)).

(٣): ئەو دەنگە دوو نەبزوێنەی كە بەبێ (بزوێن) ناتەبان و ناتوانن لە گێرفانی دامێنی بڕگەدا ئاكنجی بن و دەبێت بچنە نێو بڕگەی دوەم, وەك: (نە|ن ِك).

## ٣/١: لە ناوچوونی بزوێنی بزرۆكە:

وەك لە كۆپلەی پێشوودا گوترا، هەندێك جار دوو دەنگی (نەبزوێن) لە گیرفانی دامێنی بڕگەدا، دەتوانن لە یەك جووت ببن, بەڵام بۆ ئەم دیاردەیە دوو باری شیاو باسكرا، وەك:

**باری یەكەم:** نەبوونی بزوێنی بزرۆكە لە نێوان دوو دەنگە نەبزوێنەكەی كۆتاییدا، وەك (سارد، گەنج، دوست، مێرد،...).

**باری دوەم:** هەبوونی بزوێنی بزرۆكە لە نێوان دوو دەنگە نەبزوێنەكەی كۆتاییدا، وەك (تە|نك، تە|سك، ئا|سك، مە|مك،...).

باری یەكەم لەپێشتردا باسكرا، بەڵام گرنگی سەرباسەكە لە باری دوەمدایە، كە بزوێنی بزرۆكە هەڵ دەگرن, چونكە خۆلادان لە گۆ نەكردنی ئەم بزوێنە دەبێت بە هۆی لەنگی و نەنگی. سەبارەت بە لەناوچوونی بزوێنەكە، زۆر جار ئەم بزوێنە لە خۆیەوە ئادیو دەبێت و لە ریزەكەدا بزر دەبێت. بۆ نموونە, لە وشەی (تەنك)دا لە نێوان /ن/ و /ك/دا هەیە و بە ئاشكرا گۆ دەكرێت، كەچی لە وشەی (تەنكە)دا، لە خۆیەوە ئاودیو

دەبێت و بە دوو بڕگەی (تەنـ|كە) گۆ دەكرێت. لەئەم سەروبەندەدا ئەگەر بە زۆر بزوێنی بزرۆكە بگەڕێنینەوە بۆ نێو ریزەكە, ئەوا وشەكە بە سێ بڕگە گۆ دەكرێت، وەك: (تە|نـ|كە), بەڵام واتای دەستەواژەكە دەكەوێت بە سەر واتای كاری (بوون)دا, وەك:

## كراسەكەی شیلان زۆر (تە|نـ|كە)

لەئەم بارەدا، گۆ نەكردنی بزوێنی بزرۆكە دەبێت بە هۆی لێڵی و شێلوویی لە واتای ڕستەكەدا. بەرانبەر بەئەم دوو نموونەیە. كە نرخی بزوێنی (بزرۆكە) جودایان دەكاتەوە، لە هەندێك نموونەی تردا دووباری هەیە. بۆ نموونە، ئەگەر ئامرازی ناساندن (ەكە) بار بكەین لە (كراسی تەنك)، ئەوا دەستەواژەی (كراسە تەنكەكە) بۆی هەیە بە دوو شێواز گۆ بكرێت:

**یەكەم**: بە گۆ نەكردنی بزوێنی بزرۆكە لە وشەی (تەنك)دا، وەك: (كراسە تەنـ|كە|كە).

**دووەم**: بە گۆ كردنی بزوێنی بزرۆكە لە وشەی (تەنك)دا، وەك: (كراسە تە|نـ|كە|كە)

لە ئەم دووبارەدا، باری دووەم بڕەوی كەمترە و باری یەكەم زۆرتر چەسپاوە لە ئاخاوتندا. لەگەڵ ئەوەیشدا، ڕەنگە باری دووەم ڕێزمانیتر بێت و بتوانێت لە گۆشەیەكی تەسكی زمانەكەدا ڕەش و سپی لەیەكتری جودا بكاتەوە. بۆ نموونە، لە دەستەواژەی (تەنكەكە)دا دەشێت وشەی (تەنك) لە وشەی داڕێژراوی (تەنكە) جودا بكاتەوە، وەك:

- (تەنك) + ەكە : تە|نـ|كە|كە
- (تەنكە) + ەكە : (تەنـ|كە|كە)

لە ئەم ئاستەدا، نموونەی یەكەم هەر ئاوەڵناوی (تەنك) پەسند دەكات، كەچی نموونەی دووەم هەردوو وشەی (تەنك و تەنكە) یەكلایی دەكاتەوە. بە ڕاستی، هێشتا بە

جوانی ڕێزمانەکە دەرباز نەکراوە لە قاوغە کۆنەکەی. ئەگەرنا، دەبا ئەم بزوێنە (بزرۆکە) گرافیمی خۆی هەبا، چونکە نرخەکەی زۆر سەنگینە لە شیکاری دانسقەدا. بێگومان، ئەو نموونانەی کە لە نێو ئەم تێکستەدا باسکران، تا ئێستا بە زمانی شیری لێك جودا دەکرێنەوە، نەك بە ڕێزمان. ئێمە لە ئەو باوەڕەداین کە لە پاشەڕۆژدا، ئەوەی نوێ چارەسەرێك بۆ کێشەی ئەم بزوێنە کرۆکیە دەدۆزنەوە.

## ٤/١: چێوەی بڕگەی بزوێنی بزرۆکە:

لە کۆپلەی پێشتردا گوترا: بزوێنی (بزرۆکە) لە نێوان دوور دەنگی (نەبزوێن)دا پەیدا دەبێت لە گۆ کردندا. بۆ نموونە، لە وشەی (پەست)دا بزوێنی بزرۆکە پێویست نیە لە نێوان دەنگی /س/ و /ت/دا، کەچی ئەگەر ئەو دوو دەنگە بە ڕووتی گۆ بکرێن، بزوێنی بزرۆکە پەیدا دەبێت لە نێوانیاندا و بەبێ ئەو بزوێنە ناتوانین گۆیان بکەین. لە هەمان کاتدا گوترا: ئەگەر هەمان دەنگ وەك نموونەی (تت) پێکەوە گۆ بکرێن، ئەوا هەمدیس پەیدا دەبێتەوە. لە ئەم ئاستەدا، دەتوانین قەوارەی بزوێنی بزرۆکە بشوبهێنین بە چێوەی بەلەمێکی بەتاڵ و یەدەك لە ڕۆخی لێواندا، بۆ ئەو دەنگە نەبزوێنانەی کە بەلەمی بزوێنیان نیە و دەیانەوێت لە زار دەربچن. بێگومان، ئەوەی تا ئێستا باسکرا، تەنها هەر هەمان (بزوێن)ە کە وەك بەلەمێکی یەدەك ئامادەیە. بۆ نموونە، شیاوترین (بزوێن) کە منداڵی پۆلی یەکەمی سەرەتایی پەسەندی بکات بۆ گۆکردنی دەنگە نەبزوێنە تاکەکان[٢]، بریتیە لە بڕگەی سووکی بزوێنی بزرۆکە /i/، وەك:

---

[٢] لە نیشەکانی ئێمەدا، ئەم جۆرە گۆکردنە بە نیمچەبڕگە ناسراوە وەك گۆکردنی دەنگی /س/ لە ئەم نموونانەدا کە بڕگەی لێکدراو پێناس کراون (سنە، سنوور، سروشت).

سـ(i) : لە جیاتی (سین), د (i) : لە جیاتی (دال)

پـ(i) : لە جیاتی (پێ), كـ(i) : لە جیاتی (كاف)

نـ(i) : لە جیاتی (نوون), مـ(i) : لە جیاتی (میم)

ئەوەیش لەیاد نەكەین كە ئەم چێوە گۆكراوە بە خۆڕسكی لەسەر زمانی منداڵ و مامۆستا ڕۆژانە دووبارە دەبێتەوە, چونكە ئـەو قاڵبـە كاریگـەرترین كەرەسـتەیە بـۆ ئاشـنا كردنی منداڵ لەگەڵ دەنگە نەبزوێنەكان. بۆ نموونە، ئەگەر قـاڵبی بزوێنـەكانی تـر بـەكار هات، وەك (دە، دا، دی، دێ، دو، دوو، دۆ)، ئەوا ریزێـك لـە وشـەی واتـادار پەیـدادەبێت، كـە دەشێت بكرێن بە نموونە بۆ دەنگی /د/، نەك بۆ ناساندنی دەنگی /د/ و گرافیمەكەی، كـە لـە پلـەی یەكەمـدا دەبێـت بچەسـپێت. سـەبارەت بـە ئـەم نموونەیـە، دەتـوانین لـە چـەند هەنگاوێكدا بابەتەكە جوانتر روون بكەینەوە و بی خارێنین لە نموونەی بەجێدا, وەك:

**یەكەم:** بـزوێنی بزرۆكـە چـێوەی بڕگەیـەكی یـەدەكی هەیـە و هـەردەم (لەسـەرپێ)یە بـۆ گۆكردنی هەر (نەبزوێن)ێك كە لە تەنگژەدابێت بۆ (بزوێن)ێكی پاڵنەر.

**دووەم:** لەناسـتی نموونـەی تـردا، بـزوێنی بزرۆكـە بڕشـتی زۆرە و هیچـی كـەمتر نیـە لـە بزوێنەكانی دی و دەتوانێت ببێت بە بزوێنی هەشتەم لە گۆكردنی هـەر (نەبەزوێن)ێكدا, یان لە ئەم هەشت بڕگەیەدا (دە، دا، دی، دێ، دو، دوو، دۆ, د/i/). بۆ نموونـە, لـە سـەرەتای ئـەم وشـانەدا (درۆ, دراو, درشـت, دروسـت, دزی, دنـە, دیـە, دوا, ...), دەنگـی /د/ بـە ئـەو چەشنە گۆ دەكرێت.

### ٥/١: نموونەیەكی سەیر:

لە چەند نموونەیەكدا وەك (پشت، ناشت، تەشت، پوشت، دەشت، ...). هەردوو دەنگی /ش/ و /ت/ بە جووتە گیرفانی دامێنی بڕگەكان پڕ دەكەنەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، بزوێنی بزرۆكە لە نێوان هەر دوو نەبزوێنەكەدا نیە. وەك لە كۆپلەكانی پێشتردا باسكرا، گۆ كردنی هەردوو دەنگەكە بە رووتی وا دەكات كە پەنا ببەین بۆ چێوە پەدەگەكەی بزوێنی بزرۆكە. بێگومان، لە هەڵوێستی ئاوهادا، بڕگەی پڕی (CVc) گۆ دەكرێت وەك (شـ ـت). لە ئێرەدا، وشەی (شت) لە زاری سلێمانیدا واتادارە بە بەرانبەر وشەی (چشت یان تشت) لە هەندێك شێوەزاری تردا. كەواتە، زمانەكە خۆی خۆی ڕاست دەكاتەوە، وەك:

**یەكەم:** لە وشەی (چشت)دا، دەنگی بزوێنی بزرۆكە لە نێوان/ش/ و /ت/دا نیە، وەك وشەی (پشت).

**دووەم:** لە وشەی (چشت) و لە وشەی (پشت)دا، بزوێنی بزرۆكە جێدارە و لە پاش نەبزوێنی /چ/ و /پ/ هاتوە.

**سێیەم:** كاتێك كە وشەی (چشت) سووك كراوە و بڕگەی بەرایی لابردراوە، هەردوو دەنگی نەبزوێنی /ش/ و /ت/ بەرووتی ماونەتەوە.

**چوارەم:** لە گۆ كردنی ئەو دوو دەنگە پاشماوەیەدا، زمان پەنا دەبات بۆ چێوەی پەدەگی بزوێنی بزرۆكە. هەر لەبەر ئەوە بزوێنەكە دەكەوێتە نێوان/ش/ و /ت/.

### ٦/١- بەرەنجام و لێكدانەوە:

- بزوێنی بزرۆكە هیچی كەم نیە لە بزوێنەكانی (ە، ا، ی، ێ، و، وو، ۆ)، چونكە وەك ئەوانە خاوەنی چەندین وشەیە كە بڕگەكەی هەڵ دەگرن.

- بـزوێنی بزرۆكـه لـه هەنـدێك وشـەدا هەیـە, كـه لەیـەك بڕگـه پێكهـاتوه و ئـەو بڕگەیەیش تەنها بزوێنی (بزرۆكه) هەڵ دەگرێت، هەر له بەر ئەم هۆیـە, ناشـێت گرافیمی ئەم بزوێنه بلیمەته فەرامۆش بكرێت.
- بزوێنی بزرۆكه له هەندێك جێدا لـه خۆڕسكەوه پەیـدا دەبێـت بـۆ ناوگرایـەتی. ڕەگێشەی ئەم ناوگره له ئەوەوه هـاتوه كـه بڕگەیـەكی بۆشـی هەیـە بـە یـەدەك و هـەردەم لەسـەرپێیە بـۆ ئـەو دەنگـە نەبزوێنانـەی بـەبێ بـزوێن دەكەونـە بـەر گۆكردن.
- ئەو چێوە یەدەكەی بـزوێنی بزرۆكـه كاریگـەرترین كەرەسـتەیە بـۆ ئـەو فۆنیمـە نەبزوێنانـەی كـه مەحاڵـە بـەبێ چـێوەی (بزوێن)ێـك گـۆ بكـرێن. ئێمـە هـەر هەموومان، ئەو چێوەیە بەكار دەهێنین و پیادەی دەكەین بەبێ ئـەوەی بـیری لێ بكەینەوە، یان پێی بزانین.
- بزوێنی بزرۆكـه لـه چەندین وشـەدا لـه خـۆوه نـاودیو دەبێـت و لـه ڕیزەكـه بـزر دەبێت. ئێمه لەو باوەڕەداین كه ئەو چێوەیە بریتیە له (چـێوه یـەدەك)ەكە، كـه لـه خـۆوه پەیـدا دەبێـت (ئەگـەر پێویـست بێـت) و لـه خۆیشـەوه نـاودیو دەبێـت (ئەگـەر پێویـست نـەبێت). كەواتـە, ئەگـەر ئـەم بزوێنـە كرۆكیـە نـەبا, ئـەوا هەرهەمووومان تووشی كێشەی ئاخاوتن دەبووین.
- بزوێنی بزرۆكه نرخی خـۆی هەیـە و واتـا دەگۆڕێـت و نموونـە ئـەم و مـژدارەكان هاوێر دەكـات لـه یـەكتری. هـەر لەبـەر ئـەوه, پێویسته بـه (گـرافیم) بەرجەسـته بكرێت.
- بزوێنی بزرۆكه تەنها له بڕگەی سـووكی ئاسـاییدا نموونـەی كەمـە, یـان نموونـەی نیه، ئەمەش نەبوه به (خـەوش) و نـەبوه بـه (گـەرد) بـه ڕوویـەوه. ئـەم بزوێنـه

كاریگەری خۆی بە ئەوە قەرەبوو دەكات كە دەتوانێت ناوی فۆنیمە نەبزوێنەكان بە بڕگەی سووكی (CVo) كۆ بكات.

- بە پێی خاڵی پێشوو، بزوێنی بزرۆكە ئەگەر بەرجەستە بكرێت بە گرافیمێك، ئەوا خزمەتێكی بێ پایان پێشكەش دەكات لە شیكاری زمان و ڕێزماندا، یان لە بواری ڕێنووس و گوتنەوەی دەنگەكاندا, وەك مامۆستای گەورە ئیبراهیم باڵدار بە كارامەیی كەڵكی لێ وەرگرتوە.
- بۆ ئەو فۆرمانەی كە نرخی لۆجیكیان هەیە, بزوێنی بزرۆكە ئەگەر بەرجەستە بكرێت بە گرافیمێك، ئەوا خزمەتێكی گەورە پێشكەش دەكرێت، چی لە یەكخستنی ڕێنووسدا و چی لە ڕێكخستنی ئەلبوومی دەنگسازیدا.

## سەرچاوە:


- تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی كوردی، بەغدا ١٩٢٩.
- د. شێركۆ بابان، چێوەی بڕگەی دەنگسازی، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٤٧)، دهۆك ١٩٩٨, یان بابەتی دوەم لە كتێبی (بنچینەی دەنگسازی لە ڕێزمانی كوردیدا/ هەولێر ٢٠١٦).
- د. محەمەد مەعرووف فەتتاح، نووسینی كوردی لە ڕوانگەی فۆنەتیكەوە، گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی كورد، بەرگی نۆیەم، بەغدا ١٩٨٢.
- د. ئەوڕەحمان حاجی مارف، گیروگرفتەكانی ڕێنووسی كوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی، گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی كورد، بەرگی نۆیەم، بەغدا، ١٩٨٢.
- د. ئەوڕحمان حاجی مارف، نووسینی كوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی، بەغدا ١٩٨٦.

## بابەتی دووەم

## گەشتێك بە نێو ڕێزمانی مۆرفیمی (نەرێ)دا[4]

### ٢/١: دەستپێك:

لە زمانی كوردیدا، نیشانەكانی (نەرێ) نەختێك ئاڵۆزی پیشان دەدەن، بەڵام ڕێزمانەكەی زۆر ساناتر و ڕەوانترە لە هی زۆر بابەتی تر. هەر بۆ نموونە، ڕوخسارەكانی (نە، نی، نا، مە، ...) توخمی (نەرێنی) هەڵ دەگرن، بەڵام هەریەكێك لە ئەوانە تایبەتمەندیی خۆی هەیە و هەلومەرجی لە باری خۆی هەیە بۆ دەركەوتن. لە ئەم ڕووەوە، دەشێت نیشانەی (نە) هەر لە ڕێزمانی كاردا ببینرێت. یان، دەشێت نیشانەی (مە) هەر لە ئاستی فەرمانی ڕاستەوخۆدا ببینرێت. بەرانبەر بە ئەوانە، نیشانەی (نا) دەشێت لە ئاستی (كار) و لە ئاستی (ناوەڵناو)دا ببینرێت. بە داخەوە، ڕێزمانەكەمان هێشتا بە جوانی و بە سفتی لاپەڕەی ئەلبوومی ئەو نیشانانەی نەكردوەتەوە و هێشتا هەر بە بڕشتی زمانی ژیری لە (ئەرك) و لە (بەكارهێنان)یان تێ دەگەین. لە ئەم نووسینەدا، دەمانەوێت ئەو هێڵە سوورانە دیاری بكەین كە لە كرۆكەوە ڕێزمانی ئەو نیشانانە لە یەكتری جودا دەكەنەوە. بێگۆمان، جۆرە بابەتی ئاوها، ڕێزمانی (شل و فەل) دەكات بە ڕێزمانێكی (گرد و كۆ) و لە خشتەدراو. ئەمە و لە سەرەتادا، گەشتێك دەكەین بە نێو ئەو ڕووبەرانەدا كە ئەو نیشانانەی تێدا بەردیدە دەبێت. وەك لە نەخشەی (٢/١)دا خشتەڕێزكراون.

---

[4] گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢)، هەولێر ٢٠٠٦.

### ٢/٢: نیشانەی نەرێ (نە):

ئەم نیشانەیە تەنها هەر لە ڕێزمانی كاردا هەیە، بە ئەم چەشنە:

**یەكەم:** لە كاری رابردوودا، بەگشتی لە گەڵ ڕێژەكاندا دەردەكەوێت:

- من (نە) ڕۆیشتم.
- من (نە) ڕۆیشتبووم
- من (نە) دەرویشتم
- من (نە) ڕۆیشتوومە

| نیشانە | رووبەرە ڕێزمانییەكان |
|---|---|
| نە | - تەنها لە ڕێزمانی كاردا دەردەكەوێت.<br>- لە ڕێزمانی فەرمانی راستەوخۆدا دەرناكەوێت. |
| نی | - تەنها بەرانبەر بە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەردەكەوێت. |
| نا | - لە رانەبردووی گشت كارەكاندا هەیە.<br>- لە ڕێزمانی (ئاوەڵناو)دا هەیە. |
| مە | تەنها هەر لە ڕێژەی فەرمانی راستەوخۆدا هەیە. |

نەخشەی (١/٢): خشتەی نیشانەكانی نەرێ

بێگومان، ئەو رستانەی سەرەوە لە شێوازی ئاشكراداان و دەشێت بیان گۆڕین بۆ شێوازی (نیازداری)و بۆ شێوازی (گومانداری)، بەڵام بە هەمان نیشانەی نەرێ (نە):

- شێوازی نیازداری:

  بریا من (نە) رۆیشتبام.

- شێوازی گومانداری:

  رەنگە من (نە) رۆیشتبێتم.

دووەم: لە دەمكاتی رانەبردوودا، نەختێك ئالۆزی پەیدادەبێت بە ئەم چەشنە:

(١): بە هەمان شێوە لە شێوازی نیازداریدا، نیشانەی نەرێ بە روخساری (نە) دەردەكەوێت، بەلاّم بە دوو مۆرفیمی تێكتواوە، وەك:

با من (نە + ب) ڕۆم ← با من (نە) ڕۆم

كەواتە، نابێت چاومان بخەڵەتێت و وابزانین كە یەك نیشانەی (نە) هەیە، چونكە دوو دانە هەن. یەكەمیان سادەیە و تاكمۆرفیمیە، وەك (من نەڕۆیشتم، من نەدەڕۆیشتم). هەروەها، دووەمیان ناسادە و تێكتواوەیە، وەك (با من نەڕۆم، رەنگە من نەڕۆم).

(٢): بە هەمان رێگای شێوازی نیازداری، لە شێوازی گوماندا‌ریدا نیشانەی (نەرێ) دەردەكەوێت، وەك:

رەنگە من (نە + ب) ڕۆم ← رەنگە من (نە) ڕۆم

سێیەم: بە پێی بنەمای ئاوێنە (Mirror Principle)، لە ئاستی ئەو وشانەدا كە لە كارەوە وەرگیراون، نیشانەی نەرێ (نە) برەوی هەیە لە هەمان خانەی پلیكانەی رستەدا، كە بریتیە لە خانەی (+٢)، وەك:

سووتاو: (نە) سووتاو

سووتێنراو: (نە) سووتێنراو

بسووت: (نە) سووت

دەست گرتوو: دەست (نە)گرتوو

چاو بەستراو: چاو (نە) بەستراو

دارسووتێن: دار(نە)سووتێن

دارسووتاندوو: دار (نە) سووتاندوو

پیاو كوشتوو: پیاو (نە)كوشتوو

پیاوكوژ: پیاو (نە) كوژ، ...

یان:

كۆڵدان: كۆڵ (نە)دان

سرەوتن : (نە)سرەوتن

خەوتن : (نە)خەوتن, ...

### ٣/٢: نیشانەی نەرێ (نا):

**یەكەم**: لە شێوازی ئاشكرادا نیشانەی نەرێ (نە) روخسار دەگۆڕێت بۆ (نا)، وەك:

من (نا) ڕۆم, تۆ (نا) ڕۆیت, ئەو (نا) ڕوات

لە ئاستی ئەم بابەتەدا، دەشێت هەڵوەستەیەك بكەین, چونكە نیشانەی نەرێ (نا) لە ئەم رووبەرەدا بریتیە لە كۆلكەیەكی دوو رەگەز و دوو مۆرفیمی تێكتواوە هەڵ دەگرێت. مۆرفیمی یەكەم بریتیە لە نیشانەی نەرێ (نە) و مۆرفیمی دوەم بریتیە لە نیشانەی بەردەوامی (دە)، وەك:

من (نە + دە) ڕۆم: من (نا) ڕۆم

**دوەم**: لە رێزمانی (ئاوەڵناو)دا، نیشانەی (نەرێ) دەتوانێت بە روخساری (نا) دەربكەوێت. لە ئاستی ئەو ئاوەڵناوانەدا كە لەكارەوە وەرنەگیراون، نیشانەی نەرێ (نا) دەكەوێتە كار، وەك:

هەموار: (نا) هەموار, پاك: (نا) پاك, شیرن: (نا) شیرن, رێك: (نا)ڕێك,
بەجێ: (نا) بەجێ, كەس: (نا) كەس, پیاو: (نا) پیاو, مەرد: (نا) مەرد
بەدڵ: (نا) بەدڵ, شاد, ناشاد, خۆش : ناخۆش, بینا, نابینا, لەبار: نالەبار,
تەبا: ناتەبا, سادە: ناسادە, دیار: نادیار, روون: ناروون, كۆك: ناكۆك, ...

لە لایەكی ترەوە, ئەم دوو نیشانەیەی (نا), مەگەر هەر فۆرمی فۆنەتیكیان چوونیەك و یەكسان بێت, بەڵام زۆر زۆر جیاوازن لە یەكتری, بە ئەم چەشنە:

(١): ئەم جۆرە نیشانەیە ناچێتە سەر گشت ئاوڵناوێك، بەڵام بە (بژار) دەچێتەسەر هەندێك نموونە، كە لە گوفتاری ڕۆژانەدا پێویستن بۆ پڕكردنەوەی كەلێنی واتایەك. لە بەرانبەردا, نیشانەی (نا) بوارەكەی گشتیە و دەچێتە سەر گشت كارەكان.

(٢): نیشانەی ئاوەڵناو (نا) سادەیە و لە یەك مۆرفیم پێكهاتوە, بەڵام ئەوەی تر ناسادەیە و لە دوو مۆرفیم پێكهاتوە.

(٣): نیشانەی ئاوەڵناو (نا) هەر لە ڕێزمانی (ئاوەڵناو)دا برەوی هەیە, بەڵام ئەوەی تر لە ڕێزمانی كاردا برەوی هەیە.

(٤): لە هەندێك وشەدا, مۆرفیمی (نا) دەچێتەسەر (ناو) و ئاوەڵناو بەرهەم دەهێنێت, وەك: (ناحەز, ناجۆر, ناچار, ...).

## ٤/٢: نیشانەی نەرێ (مە):

لە ڕستەی فەرمانی ڕاستەوخۆدا، نیشانەی نەرێ بە ڕوخساری (مە) دەردەكەوێت، وەك:

تۆ (نە + بـ)ـڕۆ: من (مە)ڕۆ

لە نێرەیشدا، نیشانەی نەرێ (مە) دوو توخمە و لە دوو مۆرفیمی تێكتواوە پێكهاتوە, وەك: نیشانەی نەرێ (نە) و نیشانەی فەرمانی ڕاستەوخۆ (بـ).

## ٥/٢: نیشانەی نەرێ (نی):

لە ڕێزمانی (بوونی ئێستایی و هەبوون)دا، لە ڕستەی ئاشكرادا نیشانەی نەرێ بە ڕوخساری (نی) دەردەكەوێت، وەك:

منم: من (نی)م, من هەم: من (نی)م

بەرانبەر بە ئەم ڕوخسارە تایبەتیە، هەردوو كاری (بوون و هەبوون) لە ڕستەی نیـاز و لە ڕستەی گوماندا نیشانەی (نە) وەردەگرن، وەك:

بریا من بام: بریا من (نە)بام

بریا من هەم با: بریا من (نە)م با

بە هەمان شێوە, لە دەمكاتی ڕابردوودا هەر نیشانەی (نە) دەردەكەوێت، وەك:

بریا من بوو با (م): بریا من (نە) بووبام

بریا من هەبووبام: بریا من (نە) بووبام

بە كـورتی و بـە كـوردی, نیشـانەی نـەرێ (نـی) بریتیـە لـە نیشـانەی (نـەرێ) بـۆ مـۆرفیمی ئێسـتایی (ـە), چـی بـە دیـاری وەك (نموونـەی سـێیەم لـە خـوارەوە), یـان بـە نادیاری, وەك (پێنج نموونەكەی تر لە خوارەوە)[٥]. كەواتـە, دەشـێت نیشـانەی نـەرێ (نـی) وەك (ئەندازە) بە كار بهێنین بـۆ دۆزینـەوەی مـۆرفیمی ئێسـتایی لـە ژێـر (جێنـاو)دا. بـە پێـی بنـەمای (ئـەم ماسـتە موویـەكی تێدایـە), دەشـێت بپرسـین: ئـەدی بۆچـی لـە پێـنج جێناوەكەی تردا نیشانەی (نی) هاتە ڕیـزەوە؟ خـۆ هـەر لـە نموونـەی سـێیەمدا مـۆرفیمی ئێستایی (ـە) دیارە بە ڕوخسار.

| باری (ئەرێ) | باری (نەرێ) |
| --- | --- |
| من زیرەك (م) | من زیرەك نی (م) |
| تۆ زیرەك (یت) | تۆ زیرەك نی (یت) |
| ئەو زیرەك (ـە) | ئەو زیرەك نی (ـە) |
| ئێمە زیرەك (ین) | ئێمە زیرەك نی (ین) |
| ئێوە زیرەك (ن) | ئێوە زیرەك نی (ن) |
| ئەوان زیرەك (ن) | ئەوان زیرەك نی (ن) |

٥ بڕوانە بۆ بەشی نۆیەم لە كتێبی پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی ـە/٢٠١٥.

## ٦/٢: جۆرێكی تر لە مۆرفیمی (نەرێ):

لە وشەیەكدا وەك (كەس)، دوو جۆر لە نیشانەی (نەرێ) سەودا دەكرێت، وەك:

كەس: (نا) كەس : (بێ) كەس

بێگومان، لە ئەم نموونەیەدا ڕێزمانەكە خۆی خۆی ڕاست دەكاتەوە، چونكە وشەی (كەس) بۆی هەیە، جارێك (ناو) بێت و جارێك (ئاوەڵناو) بێت، وەك:

كەس = (ناو): وەك (دوو كەس).

كەس = (ئاوەڵناو): وەك (خزم و كەس).

لە ڕووی ناوازەییەوە، نیشانەی نەرێ (نا) سەودای (ئاوەڵناو) دەكات و بە ڕێزمانەكەی خۆی ئەو وشەیە هەڵ دەگرێت، كە بریتیە لە (ئاوەڵناو)، وەك (كەس: خزم و خوێش). لە بەرانبەردا، نیشانەی نەرێ (بێ) پێویستی بە (ناو) هەیە، نەك (ئاوەڵناو). هەر لە بەرئەوە، ئەو وشەیە وەردەگرێت كە (ناو)ە، وەك (كەس: دوو كەس). لە ئەم ئاستەدا، ئەوەی سەیرە ئەوەیە كە:

**یەكەم**: نیشانەی (نا) لە ئاوەڵناوی (كەس) دەگەڕێت و دەی كات بە (نەرێ). بە هەمان شێوە، نیشانەی (بێ) بۆ (ناو) دەگەڕێت و دەی كات بە ئاوەڵناوی (نەرێ).

**دووەم**: لە كۆتایی ئەو میكانیزمەدا، هەردوو نموونەكە هەردەبن بە (ئاوەڵناو)، وەك (ناكەس و بێ كەس). یەكەمیان ئاوەڵناوە و بەڕاستەوخۆیی دەبێت بە ئاوەڵناوی نەرێ (ناكەس)، بەلاّم دووەمیان (ناو)ە و نیشانەكە دەی كات بە (ئاوەڵناوی نەرێ)، وەك (بێ كەس). ڕێسای ئەو میكانیزمەیش بە ئەم چەشنە دادەڕێژرێت:

- ئاوەڵناوی (ناكەس):

(ئاوەڵناو+ توخمی نەرێ = ئاوەڵناوی نەرێ)

ئاوەڵناوی (بێكەس):

(ناو+ توخمی ئاوەڵناو+ توخمی نەرێ = ئاوەڵناوی نەرێ).

بێگومان، ئەم دوو ئاوەڵناوە، وەك جیاوازن بە نیشانەكان، هەر ئاوهایش جیاوازن بە (واتا). ئەمە و لە كرۆكی نیشانەی نەرێ (بێ)دا، چەند توخمێك هەیە، وەك:

**توخمی یەكەم:** توخمی ئاوەڵناو هەڵ دەگرێت و دەبێت بە پێشەنگی هەر ناوێك و دەی كات بە ئاوڵناو. بێگومان، (ناو)ەكە دەبێت بە بەشێك لە توخمی ئەو ئاوەڵناوەی كە نیشانەی (بێ) دروستی دەكات، وەك:

دەست: (بێ) دەست, چاو: (بێ) چاو, پارە: (بێ) پارە, جێ: (بێ) جێ
كەس: (بێ) كەس, دەرمتان: (بێ) دەرمتان, داهات: (بێ) داهات
خەم: (بێ) خەم, هۆڵ: (بێ) هۆڵ, ناز: (بێ) ناز, لاف (بێ) لاف, ...

لەڕاستیدا، دەروازەی ئەم توخمە ئاوەڵناوە كراوەیە بۆ گشت (ناو)ێكی بەجێ.

**توخمی دووەم:** نیشانەی (بێ) توخمی (نەرێنی) هەڵ دەگرێت. بۆ نموونە، كە دەگوترێت (بێ خەم) ناوی (خەم) بە (نەرێ)وە دەچێتە سەر ئەو كەسەی كە ئاوەڵناوەكەی بۆ بەكاردەهێنرێت. هەر بۆ پراوە، ئەو نموونانەی سەرەوە هەر هەموویان توخمی (نەرێنی) هەڵ دەگرن.

## ٧/٢: بەرەنجام و پوختەكاری:

لە نێو ئەم گەشتە ڕێزمانیەدا، دەتوانین چەند خاڵێكی پوخت بخەینەڕوو، وەك:

- لە ڕێزمانی رستەدا، توخمی (نەرێ) لە چەند نیشانەیەكدا دەردەكەوێت، وەك (نە، نی، نا، مە).
- نیشانەی (بێ) تەنها لە ڕێزمانی (ئاوەڵناو)دا بەرەوی هەیە، ئەم نیشانەیە هەم ئاوەڵناو-ڕۆنەرە (لە سەر ناو) و هەم واتای (نەرێ) دەسەپێنێت.
- نیشانەی (نی) مەودای دەركەوتنی زۆر بەرتەسكە و بە دیاریكراوی بریتیە لە نیشانەی (نەرێ) بۆ مۆرفیمی ئێستایی (ە). هەر لە بەر ئەو سەدەمە, دەشێت وەك (ئامێری دۆزەرەوە) بە كار بهێنرێت بۆ دۆزینەوەی مۆرفیمی ئێستایی داپۆشراو بە جێناو.
- نیشانەی نەرێ (مە) تەنها هەر لە رستەی (فەرمانی راستەوخۆ)دا دەردەكەوێت، بە ئەو مەرجەی كە فەرمانەكە درابێت بە سەر كەسی دووەمی تاك و كۆدا.

- نیشانەی نەرێ (نا) بۆی هەیە لە ڕێزمانی (كار)و لە ڕێزمانی (ناوەڵناو)دا دەربكەوێت. ئەو نیشانەیەی كە لە كاردا دەردەكەوێت لە دوو مۆرفیمی ناوێتە پێكهاتوە.
- نیشانەی نەرێ لە سادەترین روخساردا بـە شـێوەی سـادەی (نـە) دەردەكـەوێت، كەواتـە شێوەكانی تر ناسادەن.
- نیشانەی نەرێ (نە) بۆی هەیە كە بەناسادەیی دەربكەوێت، وەك: (رەنگە من نە ڕۆم). لە ئەم جۆرە نیشانەیەدا، رەگەزی (بـ) تواوەتەوە لە روخساری (نـە)دا، بـەڵام واتاكـەی پارێزراوە.
- لە رووبـەرێكی زۆر زۆر بچووك و نووتەكـدا, نیشـانە دوورەگـەكانی (نـەرێ), زمانەكـە دەكەن بە جۆری (تێكتواوە), بەڵام ئەمە هیچ ناگۆڕێت لـە بابەتەكە, چـونكە زۆربـەی هەرە زۆری مۆرفیمەكانی زمانی كوردی لە جۆری (پێكەوە نووساو)ن و بـە ئاسـانی لـە یەكتری جودا دەكرێنەوە.

**سەرچاوە:**


- د. شێركۆ بابان، كەڵك وەرگیراوە لە كتێبەكانی خۆمان, وەك:
  (١): مۆرفیمی ئێستایی (ـە), هەولێر ٢٠٠٦.
  (١): بەرەو ڕێزمانی ناوەڵناو/ هەولێر ٢٠١٤.
  (٢): پانۆڕامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە), هەولێر ٢٠١٥.
- لێژنـەی زمـان و زانسـتەكانی، ڕێزمـانی ئاخـاوتنی كـوردی، كـۆڕی زانیـاری كـورد، بەغدا ١٩٧٦.
- د. نەسرین فەخری: وەستانێك لە ئاسـتی هـەردوو فـەرمانی (بـوون)و (هـەبوون)و (هە)و (هی)دا، كۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی كورد، بەرگی (٢٢-٢٣)، بەغدا، ١٩٩٢.

# بابەتی سێیەم
# گرنگی وشەی (خۆ) لە ئاستی رێزماندا[6]

### ١/٣: دەستپێك:

مۆرفیمی (خۆ) زۆر بە ئالۆزی و زۆر بە پەرتی دەكەوێتە نێو تەونی زمانی نووسینەوە. ئەم كەرەستەیە هێشتا رێزمانی خۆی بۆ نەنووسراوەتەوە و ئەوەی كە لە زمانی نووسیندا دەبینرێت بریتیە لە پێز و برشتی زمانی ژیری. واتە, وەك چۆن لە سەر جادە دەی بیستین, هەر ئاوەهایش تۆماری دەكەین. ئەوەیش لە یاد نەكەین كە ئەم كەرەستەیە زۆر ئالۆزە و دەبێت رێزمانی بۆ دابین بكرێت و نەهێڵین بە هەوەسی خۆی، خۆی پەرت بكات لەزمانی نووسیندا. لە ئەم رووەوە، كەرەستەی (خۆ) بۆی هەیە بچێتە سەر رستەیەك, یان بچێتە سەر پەرێزی (فرێزیی ناوی). ئەمە و وەك (فرێزی ناوی) بۆی هەیە لە چەندین جێدا و بە چەندین شێواز بچێتە نێو كۆلكەكانی رستەوە, هەر ئاوەهایش كەرەستەی (خۆ)یش بۆی هەیە لە گشت ئەو جێیانەدا دەربكەوێت. كەواتە, بابەتەكە دەناڵێت بە رستە و بە رستەسازیەوە و لە چەندین جێدا جێگەی خۆی خۆش دەكات. هەر لە بەر ئەوە, لە كۆپلەكانی داهاتوودا هەوڵ دەدەین كە نەختێك لە تەم و مژی نێو رێزمانی كەرەستەی (خۆ) بڕەوێنینەوە.

### ٢/٣: مۆرفیمی (خۆ) لە گەڵ (بكەر)دا:

لە رێزمانی هەر رستەیەكدا (فرێزی ناوی) بۆی هەیە لەچەند جێیەكدا دەربكەوێت و لە هەر جێیەكدا كە (ناو) دەركەوت ئامرازی (خۆ) بۆی هەیە بچێتە سەری و واتاكەی خەست بكاتەوە. لە جۆرە هەڵوێستی ئاوهادا, واتایەك دەچەسپێت لە چەشنی (ئەم كەسە و كەسێكی تر نا) یان (ئەم لایەنە و لایەنێكی تر نا). لە بۆ چەسپاندنی ئەم

---

[6] گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٦٩), هەولێر ٢٠٠٦.

ڕاستیە، دەشێت ڕوو بكەین لە (پلیكانەی ڕستە) و لە ئەوێدا ئەو ڕووبەرانە دیاری بكەین كە (ناو) یان (فرێزی ناوی) ڕۆڵی تێدا دەگێرێت، وەك (١): بكەری ڕستە، (٢): بەركاری ڕستە (٣): بارگەی ئامرازی پەیوەندی. لە نەخشەی (١/٣)دا، لە سێتە نموونەیەكدا، وەك ئەوانەی (دەستەراست)، دەشێت كەرەستەی (خۆ) بچێتە سەر (بكەر)، وەك ئەوانەی (ناوەڕاست). بە سەرنجێكی ڕێزمانی سفت و دانسقە، دەبینین كە كەرەستەی (خۆ) ئامرازی پەیوەندی (بە) پەسەند دەكات و دەشێت بە ڕوخساری (بەخۆ) تۆمار بكرێت، وەك ئەوانەی (دەستە چەپ).

| بە سادەیی | لەگەڵ وشەی (خۆ) | لە گەڵ وشەی (بەخۆ) |
| --- | --- | --- |
| من دەڕۆم | من (خۆم) دەڕۆم | من (بەخۆم) دەڕۆم |
| تۆ دەڕۆیت | تۆ (خۆت) دەڕۆیت | تۆ (بەخۆت) دەڕۆیت |
| ئەو دەڕوات | ئەو (خۆی) دەڕوات | ئەو (بەخۆی) دەڕوات |
| ئێمە دەڕۆین | ئێمە (خۆمان) دەڕۆین | ئێمە (بەخۆمان) دەڕۆین |
| ئێوە دەڕۆن | ئێوە (خۆتان) دەڕۆن | ئێوە (بەخۆتان) دەڕۆن |
| ئەوان دەڕۆن | ئەوان (خۆیان) دەڕۆن | ئەوان (بەخۆیان) دەڕۆن |

نەخشەی (١/٣): كەرەستەی (خۆ) لە گەڵ بكەری جودا.

لە لایەكی ترەوە، وەك زمانەكەمان دیاردەی (پرۆدرۆپی)، واتە (بكەربەزێنی)، پەسەند دەكات، دەشێت ئەو سێتە ڕستانە (بكەری جودا) فرێ بدەن، وەك لە نەخشەی (٢/٣)دا خشتەڕێز كراون. لە ئەم نەخشەیەدا، گشت ڕستەكان ئەو دیاردەیە پەسەند دەكەن.

| بە سادەیی | لەگەڵ وشەی (خۆ) | لە گەڵ وشەی (بەخۆ) |
|---|---|---|
| ـ دەڕۆم | ـ (خۆم) دەڕۆم | ـ (بەخۆم) دەڕۆم |
| ـ دەڕۆیت | ـ (خۆت) دەڕۆیت | ـ (بەخۆت) دەڕۆیت |
| ـ دەڕوات | ـ (خۆی) دەڕوات | ـ (بەخۆی) دەڕوات |
| ـ دەڕۆین | ـ (خۆمان) دەڕۆین | ـ (بەخۆمان) دەڕۆین |
| ـ دەڕۆن | ـ (خۆتان) دەڕۆن | ـ (بەخۆتان) دەڕۆن |
| ـ دەڕۆن | ـ (خۆیان) دەڕۆن | ـ (بەخۆیان) دەڕۆن |

نەخشەی (٢/٣): كەرەستەی (خۆ) بەبێ بكەری جودا.

ئەمە و سەبارەت بە كاری (تێپەڕ)، هەمان میكانیزم هەیە و دەشێت بكەری ڕستەكە كەرەستەی (خۆ) وەربگرێت، وەك لە سەر كاری (خواردن) پیادەكراوە، نەخشەی (٣/٣).

| بە سادەیی | لەگەڵ وشەی (خۆ) | لە گەڵ وشەی (بەخۆ) |
|---|---|---|
| من دەخۆم | من (خۆم) دەخۆم | من (بەخۆم) دەخۆم |
| تۆ دەخۆیت | تۆ (خۆت) دەخۆیت | تۆ (بەخۆت) دەخۆیت |
| ئەو دەرخوات | ئەو (خۆی) دەخوات | ئەو (بەخۆی) دەخوات |
| ئێمە دەخۆین | ئێمە (خۆمان) دەخۆین | ئێمە (بەخۆمان) دەخۆین |
| ئێوە دەخۆن | ئێوە (خۆتان) دەخۆن | ئێوە (بەخۆتان) دەخۆن |
| ئەوان دەخۆن | ئەوان (خۆیان) دەخۆن | ئەوان (بەخۆیان) دەخۆن |

نەخشەی (٣/٣): كەرەستەی (خۆ) لە گەڵ بكەری ڕستەی تێپەڕدا.

**٣/٣: مۆرفیمی (خۆ) لەگەڵ (جێگری بكەر)دا:**

بە هەمان شێوە لەگەڵ كاری (بكەر نادیار)دا جێگری بكەر دەتوانێت ئامرازی (خۆ) وەربگرێت، نەخشەی (٤/٣):

| بە سادەیی | لەگەڵ وشەی (خۆ) | لە گەڵ وشەی (بەخۆ) |
|---|---|---|
| من نووسرام | من (خۆم) نووسرام | من (بەخۆم) نووسرام |
| تۆ نووسرایت | تۆ (خۆت) نووسرایت | تۆ (بەخۆت) نووسرایت |
| ئەو نووسرا | ئەو (خۆی) نووسرا | ئەو (بەخۆی) نووسرا |
| ئێمە نووسراین | ئێمە (خۆمان) نووسراین | ئێمە (بەخۆمان) نووسراین |
| ئێوە نووسران | ئێوە (خۆتان) نووسران | ئێوە (بەخۆتان) نووسران |
| ئەوان نووسران | ئەوان (خۆیان) نووسران | ئەوان (بەخۆیان) نووسران |

نەخشەی (٤/٣): كەرەستەی (خۆ) لە گەڵ جێگری بكەردا.

كەواتە دەرگای ئامرازی (بەخۆ) كراوەیە بە ڕووی ڕێزمانی (بكەر)دا و لە هەر جێیەكدا كە (بكەر) هەبێت، دەشێت ئامرازی (بە) بەكار بهێنین. لە گەڵ ئەوەیشدا، ئامرازی (بەخۆ) چەند هەل و مەرجێكی هەیە، وەك:

**یەكەم:** لە ئاستی ڕێزمانی (بكەر) و (جێگری بكەر)دا، ئامرازەكە بە ڕوخساری (بەخۆ) واتاكەی خۆی لە ڕێزمانی (بكەر)دا دیاری دەكات. كەواتە، بۆ ئەوەی بی سەلمێنین كە ئامرازی (خۆ) لە پەرێزی (بكەر)دا دەگوزەرێت، دەبێت بە ڕوخساری تەواوی (بەخۆ) ڕێنووسی بكەین. ئەمەیش خۆی لە خۆیدا بریتیە لە كلچووكێكی خنج و نیان بۆ ئارایشتكردنەوەی ڕێزمانی (بكەر) لە (زمانی نووسین)دا.

**دووەم:** بەپێی كەسی (بكەر) كەرەستەی (بەخۆ) یەكێك لە جێناوەكان وەردەگرێت، وەك:

(من) بەخۆ (م): (ئێمە) بەخۆ (مان)

(تۆ) بەخۆ (ت): (ئێوە) بەخۆ (تان)

(ئەو) بەخۆ (ی): (ئەوان) بەخۆ (یان)

كەواتە، ئەو جێناوە لكاوەی كە دەلكێت بە كەرەستەی (بەخۆ)وە ڕێك دەكەوێت لە گەڵ كەسی ئەو بكەرەی كە دەچێتە نێو پەرێزی.

سێیەم: كەرەستەی (بەخۆ) لەبۆی نیە كە جێناوەكەی لاببات، یان ئامرازی (بە) ببەزێنێت. لەكردەوەی ئاوهادا دەستەواژەكە ڕوودەكات لە (ناڕێزمان) و لە (تەم و مژ).

چوارەم: كەرەستەی (بەخۆ) لە پەرێزی بكەردا دەچێتە سەر (بكەر) لەڕابردوو و لەڕانەبردوویشدا، تەنانەت لە (فەرمانی ڕاستەوخۆ)یشدا، وەك:

| | |
|---|---|
| ڕانەبردوو | تۆ دەڕۆیت: تۆ (بەخۆت) دەڕۆیت |
| ڕابردوو | تۆ ڕۆیشتیت: تۆ (بەخۆت) ڕۆیشتیت |
| فەرمانی ڕاستەوخۆ | تۆ بڕۆ: تۆ (بەخۆت) بڕۆ |

پێنجەم: كەرەستەی (بەخۆ) بۆی نیە كە لابچێت لە گەڵ (بكەری جودا)دا. بێگومان، ئەگەر بكەرەكە لابردرا، ئەوا كەرەستەكە دەمێنێتەوە. لە ئەم نموونەیەی خوارەوەدا، جێناوی (من) لاچوو، بەڵام ناشێت و نابێت ئامرازی (بەخۆم)یش لاببەین، چونكە واتاكە دەبزرکێت:

من (بەخۆم) دەڕۆم: [redacted] (بەخۆم) دەڕۆم

شەشەم: دانانی كەرەستەی (بەخۆ) لە جیاتی (خۆ) لە پەرێزی (بكەر و جێگری بكەر)دا، پێ دەچێت كە یەك بگرێتەوە لە گەڵ كرمانجی ژووروودا. ئەم دیاردەیەیش دەشێت ڕێچكەیەك بكاتەوە بەرەو زمانی ڕێزمانداری نووسین و بەرەو یەكخستنی شێوەزارەكان. كەواتە، زمانەكە بە خۆی خۆی ڕاست دەكاتەوە و لە ئاستی كەرەستەی (خۆ)دا، پەرێزی (بكەر) جودا دەكاتەوە لە پەرێزی گشت بابەتەكانی تر.

### ٢/٢: مۆرفيمى (خۆ) وەك (بەركار):

لە پەرێزى ڕێزمانى (بەركار)دا, كەرەستەى (خۆ) بە هيچ جۆرێك بۆى نيە كە ئامرازى (بە) وەربگرێت, چونكە ديـاردەى (بزڕكانـدن) ڕوو دەدات. لەلايـەكى تـرەوە, كەرەستەى (خۆ) نەختێك ئاڵۆزى نيشان دەدات لە پەرێزى بەركاردا, وەك:

**يەكەم**: ئەگەر (بكەر) و (بەركار)ى ڕستەكە هەمان كەسى ڕێزمـانى بـوون, ئـەوا دەشـێت جێناوە لكاوەكان (م، ت، ى، مان، تان، يان) فەرامۆش بكرێن. بـە سـەرنجێكى زيـت و زرنـگ لە ئەو نموونانەى خوارەوە, دەردەكەوێت كـە (لابـردن) و (دانـان)ى جێناوەكـانى (م، ت، ى، مان، تان، يان) هيچ ناگۆڕێت لە بابەتەكە, وەك:

| لەگەڵ (جێناو) | بەبێ (جێناو) |
| --- | --- |
| من خۆ (م) دەشۆم | من خۆ دەشۆم |
| تۆ خۆ (ت) دەشۆيت | تۆ خۆ دەشۆيت |
| ئەو خۆ (ى) دەشوات | ئەو خۆ دەشوات |
| ئێمە خۆ (مان) دەشۆين | ئێمە خۆ دەشۆين |
| ئێوە خۆ (تان) دەشۆن | ئێوە خۆ دەشۆن |
| ئەوان خۆ (يان) دەشۆن | ئەوان خۆ دەشۆن |

ئەگـەر جـەخت لەسـەر ئـەوە بكـەين كـە دەبێـت جێناوەكـانى كەرەسـتەى (خـۆ) ڕێنووس بكەين, ئەوا كێشەيەك دەهێتە ئاراوە, چونكە دوو جێنـاوى (هاوڕوخسـار) بۆيـان هەيـە پێكـەوە بچنە سـەر كەرەسـتەى (خـۆ). بـۆ نموونـە, لـە ڕابـردوودا (جێنـاوى بكـەر) بريتيە لە سێتە جێناوى (م، ت، ى، مان، تان، يان) و ئەم جێناوانە جێگۆڕن و باز دەدەنـە سەر بەركارى (خۆ) و جووت دەبن لە گەڵ جێناوەكانيدا, كە بريتـين لـە هـەمان (م، ت، ى، مان، تان، يان), وەك:

من خۆ (م) (م) شۆرد

تۆ خۆ (ت) (ت) شۆرد

ئەو خۆ (ی) (ی) شۆرد

ئێمە خۆ (مان) (مان) شۆرد

ئێوە خۆ (تان) (تان) شۆرد

ئەوان خۆ (یان) (یان) شۆرد

هەر بۆ پراوەم لە رستەی یەکەمدا جێناوی (م)ی بەرایی بریتیە لەجێناوەکەی کەرەستەی (خۆم) بەڵام (م)ی دوایی بریتیە لە جێناوی (بکەر) لە کاری (شۆردم)دا و بەمیکانیزمی (جێگۆڕکێ) بازی داوە بۆ سەر بەرکاری (خۆم). ئەم جۆرە کێشەیە دەشێت دەزگایەکی ئەکادیمی یەکلایی بکاتەوە. ئەوەی لە سەر ئێمەیە، ئەوەیە کە کێشەکە بیراز بکەین و بە بیرازەوە بیخەینە سەر خوانی زمانی نووسین. سەرەڕای ئەوەی گوترا، مۆرفیمی (خۆ) لە پەرێزی (بەرکار)دا بریتیە لە (بەرکار)ێکی دانسقە، چونکە (بەرکار) چێ دەکات لە هەمان کەسی (بکەر) و بۆ هەمان کەسی (بکەر). هەر بۆ نموونە، ناتوانرێت جێناوی (من) بکرێت بە (بەرکار) لە بۆ بکەری (من)، وەك:

(من) (من) دەشۆم*

لەجیاتی:

(من) (خۆ) دەشۆم، یان: (من) (خۆم) دەشۆم

کەواتە، ئامرازی (خۆ) دەرگایەکی جوان دەکاتەوە لە پەرێزی کاری (تێپەڕ)دا، وەك:

(خۆ) نووسین، (خۆ) کوشتن، (خۆ) گرتن

(خۆ) ناردن، (خۆ) شۆردن (خۆ) کردن بە،

(خۆ) سووتاندن، (خۆ) ڕەنجاندن، (خۆ) لادان، ...

لە ڕاستیدا، دەرگای ئەم میكانیزمە كراوەیە و ژمارەی كارە (تێپەڕەكان) دەكات بە (دووجاران). ئەمە و لە ئەو میكانیزمەدا، هەندێك لە كارەكان بەرانبەر بە واتای كارێك دەوەستن لەزمانێكی تردا، وەك: (خۆكوشتن، خۆشۆردن، خۆناسین، خۆنووسین، خۆبەخشین، ...). بێگومان، ئەم بڕاڤە هەر هەندێك لە كارەكان دەگرێتەوە، كە دەشێت ناو بنرێن (كاری خۆیی)، چونكە كۆلكەی (خۆ) دەكەن بە (بەركاری واتابەست). لە بۆ نموونە، كاری (خۆكوشتن) بەرانبەر بە (انتحار) دەوەستێت، یان كاری (خۆشۆردن) بەرانبەر بە (إستحمام) دەوەستێت. لە ئەو دوو كارەدا كە لە زمانی عەرەبیدا هەن، وشەی (قتل) یان (غسل) لە بەرچاو نیە، یان نادیدەیە، بەڵام لە كارە كوردیەكاندا وشەی (كوشتن) یان (شۆردن) هەر لە بەر دیدەن، كەچی مۆرفیمی (خۆ) ئەركی (بەركاری ڕاستەخۆ)ی بۆ خۆی فۆرخكردوە و واتای كارەكانی بەستوە بە واتایەكی تازەوە.

دوەم: ئەگەر (بكەر) و (بەركار)ی ڕستەكە هەمان كەسی ڕێزمانی نەبوون، ئەوا كێشەكە ڕوونتر دەبێتەوە وەك:

| | | |
|---|---|---|
| من | خۆم<br>خۆت<br>خۆی<br>خۆمان<br>خۆتان<br>خۆیان | دەنووسم |

بە سەرنجێكی هورد، دەردەكەوێت كە دەشێت، لە نموونەی یەكەمدا، جێناوی (م) لە (خۆم)دا لاببەین، وەك: (من خۆ | دەنووسم) لەجیاتی (من خۆم دەنووسم). لە بەرانبەردا، لە پێنج كەسەكەی تردا ناتوانین جێناوەكان لاببەین، چونكە واتاكە دەشكێتەوە بە سەر (بەركار)ێكدا لە چەشنی ئەو كەسە ڕێزمانیەی كە (بكەر)ەكە هەڵی

گرتوە. واتە, لابردنی جێناوەكانی (م، ت، ی، مان، تان، یان) دەبێت بـە هـۆی یەكسانبوونی هەر شەش ڕستەكە بە ڕستەیەك لە چەشنی (من خۆ دەنووسم), كە (بكەر) و (بەركار) بە یەكەوە ڕوو دەكەن لە هەمان كەسی ڕێزمانی.

**سێیەم: نموونەیەكی سەیر:**

لە بەشەكانی پێشوودا گوترا: دەشێت جێناوەكانی كەرستەی (خـۆ) لابـبردرێن, ئەگەر (بكەر) و (بەركار) لە هەمان كەسی ڕێزمانی بوون. بەڵام لە ئاخـاوتنی كوردەواریـدا هەر دوو جۆرەكەی هەیە, وەك:

تۆ خۆ (ــ) دەشۆریت: تۆ خۆ(ت) دەشۆریت

ئێوە خۆ (ــ) دەشۆرن: ئێوە خۆ(تان) دەشۆرن

لـە ڕاستـیدا, كاتێـك كـە جێناوەكـە لادەبرێـت, وەك نموونـەكانی (دەستـە ڕاست), مۆرفیمی (خۆ) واتای بەركارێكی (واتاگۆڕ) دەچەسپێنێت. واتە, بـە جۆرێـك لـە جۆرەكـان, مۆرفیمی (خۆ) بوە بە (بەركار) و واتای كاری (شۆردن)ی گۆڕیـوە بـۆ واتـای (خۆشۆردن). بۆ پاساودانی ئەم ڕاستیە, ئەگەر بـەركاری (خـۆ) لاببـەین, ئـەوا واتـای كـاری (خۆشـۆردن) ناودیو دەبێت بە دیوی واتـای كـاری بنجی (شـۆردن)دا. لـە نموونـەكانی (دەسـتە چـەپ)دا, كاتێك كە جێناوەكانی (ت، تان) دانران, دوو واتادانەوە دەچەسپێت, وەك:

(١): وەك هـەردوو نموونەكـەی (دەستەڕاسـت), واتـای (خۆشـۆردن) دەچەسـپێت, چـونكە هـەردوو ڕستـەكە {تـۆ خـۆ (ــ) دەشـۆریت} و {تـۆ خـۆ(ت) دەشـۆریت} یـەك واتـا هـەڵ دەگرن, بەڵام لە نموونەی دوەمـدا جێنـاوی (ت) لـە حـوكمی (مـۆرفیمی بۆش)دایـە, لەبـەر ئەوەی هەر فۆرمی فۆنەتیكی هەیە.

(٢): لە نموونەی{تـۆ خـۆ(ت) دەشـۆریت}دا, ئەگـەر جـەخت بكـەین و جێنـاوی (ت) لـە حوكمی (مۆرفیمی بۆش) دەربكەین, ئـەوا واتایـەك دەچەسـپێت لـە چەشـنی {تـۆ خـۆ(ت) دەشۆریت, ئەی كەسی تر ناشۆریت؟} . لە ئەم جۆرە ڕستەیەدا, پـێ دەچـێت كە مـۆرفیمی

(هەر) ناودیو كرابێت، چونكە لە بەكارهێنانندا واتا تێكئاڵاوەكان لە یەكتری جودا دەكاتەوە، وەك {تۆ هەر خۆ(ت) دەشۆریت}[٧].

## ٤/٣: مۆرفیمی (خۆ) وەك تەواوكەری (بەركار):

لە هەندێك جێدا وشەی (خۆ) دەنووسێت بە تەواوكەری (بەركار)ەوە، وەك:

من ناوی (تۆ) دەنووسم : من ناوی (نێوە) دەنووسم

بۆ جەختكردن، لە ئەم رستەیەدا دەستەواژەی (خۆت) و (خۆتان) بۆیان هەیە ببن بە تەواوكەری كۆلكەی (بەركار)، وەك:

من ناوی (خۆت) دەنووسم : من ناوی (خۆتان) دەنووسم

بە هەمان شێواز، ئەگەر (بكەر) و (بەركار) هەمان كەس بوون، دەشێت هەر وشەی (خۆ) بە كاربهێنن وەك:

من ناوی(خۆم) دەنووسم

یان، دەشێت جێناوەكە لابرێت، وەك:

من ناوی (خۆـ) دەنووسم

## ٥/٣: وشەی (خۆ) لەگەڵ ئامرازدا:

لەسێتە نموونەیەكدا وەك:

من نامەكەم دا بە خۆت

من نامەكەم دا بە خۆی

[٧] بڕوانە بۆ هەردوو بەشی (١٢ و ١٣) لە كتێبی (گەشتێك بە نێو ئامرازەكانی رێزمانی كوردیدا)/ هەولێر ٢٠١٦.

من نامەكەم دا بە خۆتان

من نامەكەم دا بە خۆیان

وشەی (خۆ) بوە (بەركاری ناڕاستەوخۆ)، بەڵام دەشێت هەمان وشە ببێت بە (تەواوكەر) بۆ بەركاری ناڕاستەوخۆ، وەك:

من نامەكەم دا بە دەستی خۆت

من نامەكەم دا بە دەستی خۆی

من نامەكەم دا بە دەستی خۆتان

من نامەكەم دا بە دەستی خۆیان

### ٦/٣: نموونەیەكی ئاڵۆز:

لـە نموونەیەكـدا، وەك: (مـن خـۆم دەنووسـم)، چـەند ئاڵۆزییـەك هەیـە، چـونكە نازانین كەرەستەی (خۆ) لە پەڕیزی (بكەر)دایە؟ یان لە پەڕیزی (بەركار)دایە؟ بە ڕاستی، ئەگەر مۆرفیمی (خۆ) بـە ڕوخساری (بـەخۆ) بنووسـرابا، ئـەوا كێشـە دروسـت نـە دەبوو، چونكە ڕێزمانەكە خۆی بە خۆی خۆی ڕاست دەكردەوە و پەڕیزی ڕێزمانی (بكەر) ئاشكرا دەبوو و جـودا دەبـوەوە لـە پـەڕیزی (بـەركار)، وەك: (مـن بـەخۆم دەنووسـم). بێگومـان، ڕوخساری (بەخۆ) پەڕیزی (بكەر) داگیر دەكات و ئەگەر بمانەوێت، دەتوانین (بـەركار)یش ڕیز بكەین، وەك: (من بـەخۆم خـۆ دەنووسـم، یـان مـن بـەخۆم خـۆم دەنووسـم). لـە گـەڵ ئەوەیشدا، ئەگەر دوو جار دەستەواژەی (خۆم) بنووسین، وەك: من خـۆم خـۆم دەنووسـم)، ئەوا ئاڵۆزی نامێنێت و هـەردوو پـەڕیزی (بكـەر) و (بـەركار) دەبـن بـە لێكجـودا. كەواتـە، دەشێت ڕوخساری (بەخۆ) بە تەواوەتی تەرخان بكەین بۆ پەڕیزی (بكەر) و نەهێلین ئـەو پەرپووتیە پەیدا ببێت لە نێوان دوو واتادنەوەی جیاوازدا. سەبارەت بە دەمكاتی ڕابـردوو، ئەم ئاڵۆزیە بەرپا نابێت، چونكە دووباری شیاو هەیە:

من (خۆم) دەنووسم: من (خۆم)م نووسی

من (خۆم) دەنووسم: من (خۆم) نووسیم

لە نموونەی یەكەمدا, دەستەواژەی (خۆم) بریتیە لە (بەركار) و جێناوی لكاو بۆی هەیە باز بداتە سەری و دەستەواژەی (خۆمم) پەیدا ببێت. لەنموونەی دوەمدا, وەك دەستەواژەی (خۆم) لە پەرێزی (بكەر)دایە, ناشێت جێناوی (م) باز بدات, چونكە لە سەر (بكەر) جێبازی نیە بۆ بازدان. هەروەها, لە رستەی دوەمدا دەشێت بنووسین:

من (بەخۆم) دەنووسم: من (بەخۆم) نووسیم

### ٧/٣: نموونەیەكی تێكهەڵكێش:

لە ڕستەیەكی ئاڵۆز و بارگراندا, دەشێت چەند جارێك دەستەواژەی (خۆ) بەكاربهێنین وەك:

من (بەخۆم) بەدەستی (خۆم) (خۆم) دەشۆم

تۆ (بەخۆت) بەچاوی (خۆت) (خۆت)ت بینی

هاورێكەی (خۆت) بەچاوی (خۆی) (خۆت)ی ناسیەوە

ئێمە (بەخۆمان) بەچاوی (خۆمان) نامەكەی (خۆت)مان بینی

ئێوە (بەخۆتان) نانی (خۆتان) بەدەستی (خۆتان) پەیدا دەكەن

لە ئەم ڕوەوە, نموونەی زۆر ئاڵۆز هەیە, بەلام لە ئێرەدا ئەم چەند نموونەیە بەسە. هەرچەندە بابەتەكە هێشتا بە تەواوی پاراو نەبوە و دەتوانرێت نموونەی دژوارتریش ڕیز بكرێت. واتە, گرنگ ئەوە نیە لە سەر باری پانی و درێژی نموونە ڕێز بكەین, بەلام گرنگ ئەوەیە كە لە یەك نموونەدا بەرەو قووڵیی هەنگاوی شیكارسازیانە بكەینەوە.

### ٨/٢: نموونەی (خۆ بەخۆ):

ئاوەڵناوی (خۆ بە خۆ) لە میكانیزمێكی زۆر ئاڵۆز و چڕەوە دروست بوە. ئەم ئاوەڵناوە وەك گشت ئاوەڵناوێكی تر بۆی هەیە ناوی واتایی چێ بكات ,وەك (خۆ بە خۆیی). لە نموونەیەكدا وەك: (من دەڕۆم), دەشێت وشەی (خۆ) دووجار بار بكەین, وەك:

من (خۆم بە خۆم) دەڕۆم

یان, من (خۆم بە خۆم) دەخۆم

یان دەشێت جێناوەكان لابدەین وەك:

من (خۆ بەخۆ) دەڕۆم

من (خۆ بەخۆ) دەخۆم

كەواتە, بكەری ڕستە بۆی هەیە دووجار ئامرازی (خۆ) وەربگرێت, یەكەمیان بۆ خودی بكەرەكە و دوەمیان بۆ ئەركی بكەرەكە لە ڕستەكەدا. لە دەرەئەنجامی ئەم لێكدانەدا ئاوەڵناوی (خۆ بەخۆ) پەیدابوە, كە كەم و زۆر واتای خوازراوی (ئۆتۆماتیك) دەخاتە ڕوو, یان لە عەرەبیدا دەشێت بەرانبەر بە زاراوەی (تلقائی) بوەستێت. بە راستی, زمانەكەمان زۆر بە بڕشتە لە مۆرفیمی (بە)دا, بە ڕێسای (ناو + بە + ...), وەك: (شەرم بە خۆ, دەر بە دەر, لا بە لا, جێ بە جێ, ژێر بە ژێر, دەست بە سەر, لێو بە بار, دەم بە هاوار....). یان بۆ ئامرازی (لە), وەك: (گوێ لە مست, چاو لە دەر, چاو لە ڕێ, یان چاوەڕێ, سەر لە بەر, داخ لە دڵ, خۆ لە خۆ, گومان لە خۆ, ...).

### ٩/٣: ئامرازی (خۆ) لە وشەڕۆناندا:

لــە ڕووبــەری زمــانی كوردیــدا, لەچــەندین وشــەدا مــۆرفیمی (خــۆ) بــوە بــە پێكهاتەیەك وەك: {ڕاستەوخۆ ، ناوخۆ ، خۆ بە خۆ, بە خۆ, سەربەخۆ ، لەخۆڕا، لە خۆیەوە، خۆیی، ماڵەخۆ ، لەسەرخۆ ، خۆخۆ یی، خۆجێ, ....} . لە گەڵ ئەوەیشدا, لە چەندین كاردا بەركاری (خـۆ) واتـای نـوێی چـێكردوە، وەك: (خۆپەرسـتن، خۆبەخشـین، خۆفرۆشتن، خۆكوشتن، خۆگرتن، خۆڕشتن، خۆشۆردن، خۆگوشین، خۆناسین، خۆنووسـین, ...). ئـەم جـۆرە چـاوگە دەشـێت (ناوەڵنـاو) ببەخشـن و ئـەو ئاوەڵنـاوەیش نـاوی واتـایی ببەخشـێت, وەك: (خۆپەرسـت: خۆپەرسـتیی, خۆبـەخش: خۆبەخشـی, خـۆفرۆش: خۆفرۆشـی, خۆكـوژ: خۆكـوژی, خـۆگر: خـۆگری, خۆڕێـژ: خۆڕێـژی, خۆشـۆر: خۆشـۆری, خۆگوش: خۆگوشی, خۆناس: خۆناسی, خۆنووس: خۆنووسی, ...).

هەر لەبۆ نموونە (خۆنووس) ئەو كەسـەیە كە دەچـێت نـاوی خـۆی تۆمـار بكات لەجێگەیـەك. بـە هـەمان شـێوە, (خۆنووسـیی) واتـای كـردەوەی نـاوی خـۆ تۆمـاركردن دەبەخشێت لـە هۆبـەی (خۆنووسـی) بـەواتای (التسجیل). بێگومـان, لەئـەم جـۆرە كارەدا وشەی (خۆ) دەبێت بە (بەركار) بـۆ هـەمان (بكـەر) و چـاوگێك پەیدا دەبێـت لـە چەشـنی (بـەركار + چـاوگ). ئـەم جـۆرە چـاوگەیش گەردانننامـەی خـۆی هەیـە, چـی لـە بزاڤـی ڕستەسازی تێپەڕدا و چی لە بزاڤی وشە ڕۆناندا.

### ١٠/٣: بەرەنجام و پوختەكاری:

لە چەشنی كەرەستەی (خۆ), ئامرازێكی ڕێزمـانی هەیـە بـە هـەمان ڕوخسـار, كە واتای سەرسووڕمان دەبەخشێت, وەك: (خـۆ شـیلان نـەهات). ئـەم ئـامرازە دەچـێتە سـەر (ڕستە), نەك سەر (نـاو), بـەڵام ئـەركێكی دیكـەی هەیـە, كـە بـە تـەواوی جودایـە لـە ئـەو بابەتەی كە لە ئەم نووسینەدا سەودا كراوە. كەواتە ئەم دوو مۆرفیمە تـەنیا و تـەنیا هـەر بـە (ڕوخسـار) لـە یـەكتری دەچـن و هـەردووكیان بەشـێوەی (خـۆ) ڕێنـووس دەكـرێن. لـە لایەكی تردەوە, ڕوخسارێكی دیكـە هەیـە لـە شـێوەی (ئـاخۆ), كـە پـێ دەچـێت كـورتكراوەی

دەسـتەواژەی (ئایـا + خـۆ) بێـت. ئەمـە و لـە دروێنـەی بەرەنجامەكانـدا, دەتـوانین چـەند خاڵێك تۆمار بكەین, وەك:

- لە پەرێزی (بكەر)دا وشەی (خۆ) دەتوانێت چالاكی بنوێنێـت, چـی وەك (بكـەر) وەك (من بەخۆم هاتم), چی وەك (تەواوكەری بكەر) وەك (براكەی خۆم هات).
- لە ئەو جێیەدا كە وشەی (خۆ) رۆڵی راستەوخۆی (بكەر) دەنوێنێـت, دەشـێت كەرەسـتەی (بەخۆ) بەكاربهێنرێت. ئەم خاڵە بریتیە لە دەستەبەرەیەكی گرنگ لـە بـۆ پوختـەكردنی زمانی نووسین بە جوداكردنەوەی پەرێزی (بكەر) لەپەرێزی كۆڵكەكانی تر.
- وشەی (خۆ) بۆی هەیە بچێتە جێی (بـەركار), یـان جێـی (تەواوكـەری بـەركار), وەك (من خۆم دەشۆرم), یان (من دەستی خۆم دەشۆرم).
- وشەی (خۆ) بۆی هەیە بچێتە سەر ئـامرازی پەیوەنـدی, وەك: (مـن نامەكـە بـۆ خـۆت دەنێـرم), یـان بچـێتە جێـی تەواوكـەری بارگـەی ئامرازەكـە, وەك: (مـن نامەكـە بـۆ مامۆستاكەی خۆت دەنێرم).
- مۆرفیمی (خـۆ) لـە پـەرێزی (فرێـزی نـاوی)دا جێناوەكـانی خـاوەنێتی (م، ت، ی، مـان، تان، یان) هەڵ دەگرێت.
- دەشێت مۆرفیمی (خۆ) هەمان كەسی رێزمانی بۆ (بكەر) و بۆ (بەركار) لـە سـەر یـەك رستە كۆبكاتەوە. لە هەڵوێستی ئاوهادا دەشێت جێناوەكان لابچن وەك (من خۆ دەشۆم) لە جیاتی (من خۆم دەشۆم). لە ئەم بەكارهێنانەدا, هەندێك لـە كارەكـان بـە بـەركاری (خۆ) واتایان گۆراوە بە دیوێكی تردا, وەك (شۆردن و خۆشۆردن).
- گرنگترین رۆڵی وشەی (خۆ) بریتیە لـە رۆڵـی (بـەركار). كەرەسـتەی (خـۆ) دەچێتە سـەر كاری تێپەر وەك كۆڵكەی (بەركار) دەلكێت بە چاوگی كارەكەوە و دەی گۆرێـت بـۆ (كـاری خۆیی). هەنـدێك جاریش ژمارەی كارەكان زیـاد دەكـات بـە (واتاگۆركـێ) و كـەلێنی چـەند كارێك پڕ دەكاتەوە وەك (خۆكوشتن، خۆنووسین، خۆناسین، خۆشۆردن، خۆگردن،...).

- لە بواری (بكەر)دا, دەشێت ئامرازی (خـۆ) بخەینـە گـەڕ, وەك: (مـن دەڕۆم: مـن خـۆم دەڕۆم, مـن خـۆم بـەخۆم دەڕۆم, مـن ـــ بـەخۆم دەڕۆم). بێگومـان واتـای ئـەم چـوار ڕستەیە لە یەكتری جودا دەبنەوە, بە ئەم چەشنە:

(١): واتای ڕستەی یەكەم (من دەڕۆم) ڕوونە و ئاشكرایە.

(٢): واتای ڕسـتەی دووەم (مـن خـۆم دەڕۆم) مەبەسـتێك هـەڵ دەگرێـت وەك (كەسـێكی تـر ناڕوات).

(٣): واتای ڕستەی سێیەم (من خۆم بەخۆم دەڕۆم) دوو مەبەست هەڵ دەگرێت, یەكەمیان واتای (كەسێكی تر نا) و دووەمیان واتای (هاوكاری كەسم ناوێت).

(٤): ڕستەی چوارەم (من بەخۆم دەڕۆم) مەبەست ئەوەیە كە (هاوكاری كەسم ناوێت).

- لەخاڵی پێشەوەدا, دەشێت ڕستەی سێیەم جارێكی تر بار بكەین بە كەرەسـتەی (خـۆ), بەڵام بۆ مـەبەستێكی تـر:

(١): خۆ من (خۆم) (بەخۆم) دەڕۆم

یان: (٢): خۆ من (خۆ بەخۆ) دەڕۆم

یان: (٣): خۆ من (خۆم) (خۆ بەخۆ) دەڕۆم

یان: (٤): خۆ من (خۆم) (بەپارەی خۆم) دەڕۆم

لە ئەم ڕسـتانەدا, كەرەسـتەی (خـۆ), ئـەوەیان كـە لـە بەراییـدا بـەكارهێنراوە, لـە چەشـنی ئـەو ڕەگەزەیـە كـە دەچـێتە سـەر (ڕسـتە). ئـەم كەرەسـتەیە لـە پێشـەكی ئـەم كۆپلەیەدا باسكراوە.

**سەرچاوە:**


- لێژنەیەك لەوەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی كـوردی بـۆ پـۆلی پێنجـەمی ئامـادەیی بەغدا ٢٠٠٤.

- د.شـێركۆ بابـان، هەنـدێك لـە ئیشـەكانی خۆمـان لـە ئـەم بـوارەدا, كـە هێشـتا بـڵاو نەكراونەتەوە.

# بابەتی چوارەم

# پۆلێنكردنی تەرزسازیانەی زمانی كوردی

# لە زمانەوانی بەراوردكاریدا[8]

## ١/٤: دەستپێك:

لە ئەو لقەی زمانەوانیدا كە بە زمانەوانی بەراوردكاری ( Comparative Linguistics) ناسراوە، بە دوو ڕێگادا بەراورد ئەنجام دراوە. لە ڕێگای یەكەمدا، پەیوەندی مێژووی و خزمایەتی نێوان زمانەكان خراوەتە بەر مەبەست. لە ڕێگای دووەمدا، بایەخ نەدراوە بە مێژووی زمان و خزمایەتی ئەو زمانە لە گەڵ هی تردا، بەڵكوو بایەخ دراوە بە ئەو لێكچوونەی كە لە ئاستی ڕستەسازی و وشەسازیدا هەیە. ئەم جۆرە لێكۆڵینەوەیە بە پۆلینكردنی تەرزسازیانە ناسراوە (Typological Classification)، كە كەڵكێكی زۆر دەبەخشێت بە بزاڤی لێكۆڵینەوەسازی لە زمانی كوردیدا، بە ئەم چەشنە:

**یەكەم:** بە هۆی ئەم جۆرە بەراوردەوە، خەسڵەتە زانستیەكانی تەرزی زمانەكە دیاری دەكرێن و هێڵە پانەكانی ڕێزمانی كوردی دەخرێنە ڕوو.

**دووەم:** پێگەی زمانی كوردی دیاری دەكرێت بە بەراورد لەگەڵ زمانی بەندەی سەر زەویدا. ئەم جۆرە پێگەیە دەری دەخات كە زمانەكەمان تەرزە زمانێكی تایبەتیە و سیمای سەربەخۆیی خۆی هەیە، وەك زمانی گشت میللەتان.

---

[8] گۆڤاری (ئەكادیمی)، ژمارە (٥)، هەولێر ٢٠٠٧.

**سێیەم:** جۆرە لێكۆڵینەوەی ئاوەها ورد، بریتیە لە هەنگاوێكی دەستپێكی بۆ شرۆڤە كردنی زمانی كوردی. بۆ نموونە، ئەگەر زانرا زمانەكەمان لە تەرزی بكەربەزێنە (پرۆ درۆپ)، ئەوا لە یەكەم هەنگاوەوە ڕێگای لێكۆڵینەوە ڕوون دەبێتەوە و چرایەك هەڵ دەبێت لەنێو بیری توێژەردا، چی بە یەكسانی لەگەڵ زمانانی هەمان تەرزدا، چی بە جیاوازی لە گەڵ زمانی تردا. بۆ نموونە، زمانی ئینگلیزی و زمانی فەرەنسی لە جۆری (پرۆ درۆپ)نین و هەر لە سەرەتاوە، تی دەگەین كە خاڵی جیاوازی لە كوێدایە. ئەم دیاردەیە لە كۆپلەكانی پاشتردا ڕوون دەكرێتەوە.

**چوارەم:** جۆرە پۆلێنكردنی ئاوها، بنەما زانستیەكانی بزافی (وەرگێڕان) دیاری دەكات. بۆ نموونە، ئەگەر زمانی كوردی لە چەشنی ریزبەندی (بكەر ـ بەركار ـ كار) بێت، ئەوا زۆر بە ئاسانتر وەردەگێڕدرێت بۆ زمانێكی تر كە هەمان ریزبەندی هەبێت. بە هەمان شێوە، بزافی وەرگێڕان دژوارتر دەبێت ئەگەر بە زمانێكی تر بەراورد بكرێت كە هەمان ریز بەندی نەبێت. بۆ نموونە، ریز بەندی زمانی عەرەبی بریتیە لە (كار ـ بكەر ـ بەركار) و ریز بەندی زمانی ئینگلیزی بریتیە لە (بكەر ـ كار ـ بەركار). لە جۆرە هەڵوێستی ئاوهادا، بزافی وەرگێڕان زۆر بە گرانی دەگەڕێت. بە واتایەكی تر، بزافی وەرگێڕان زۆر بە ئاسانی دەگەڕێت لەنێوان زمانە هاوتەرزەكاندا.

**پێنجەم:** ئەم پۆلێنكردنە، هەندێك بیر و بۆچوونی پووچ و بی بنەما هەڵ دەوەشێنێتەوە، كە زمانی كوردی بە (كەم) بزانێت، لە چاو ئەو زمانانەدا كە بە زۆرەملی بەسەر منداڵە چاوگەشەكانی كوردا دەسەپێنرێن.

**شەشەم:** لە كۆتایی ئەم نووسینەدا، دەتوانین پێناسەیەكی زانستی بۆ زمانەكە بنوسین و بە ئەو پێناسەیە، زمانەكەمان بناسێنین بە گشت زانایانی زمانەوانی. ناوەڕۆكی ئەو پێناسەیە لە دووتوێی ئەم نووسینەدا ڕوون دەبێتەوە.

سەرەڕای ئەوەی گوترا، دەشێت هەندێك خەسڵەتی تری زمانەكەمان بخەینە ڕوو، كە هێشتا دەرخواردی بزاڤی زمانەوانی بەراوردكاری نەدراون.

## ٢/٤، بنەمای ڕیزبەندی وشەكان (Word Order)،

زمانانی گەلانی سەر زەوی، بە پێی ڕیزبەندی كۆلكەكانی رستە پۆلێنكراون. لە ئەو ڕیزبەندەدا، سێ كۆلكەی سەرەكی لە رستەدا بە هەند وەرگیراون، كە بریتین لە (بكەر) بە هێمای (S)، (بەركار) بە هێمای (O) و (كار) بە هێمای (V). بە واتایەكی تر، ڕیزبەند (بكەر، بەركار، كار) وەك پێوەرێك بەكارهێنراوە بۆ بەراورد كردنی زمانەكان لەنێوان خۆیاندا. ئێستایش ئەگەر هەر سێ هێماكەی سەرەوە لە یەكتری بدەین، دەبینین كە شەش ڕیزبەند پێك دەهێنین، نەخشەی (١/٤):

| ڕیزبەند | ڕیزبەند بە هێما |
|---|---|
| (بكەر : بەركار : كار) | SOV |
| (بكەر : كار : بەركار) | SVO |
| (كار : بكەر : بەركار) | VSO |
| (كار : بەركار : بكەر) | VOS |
| (بەركار : كار : بكەر) | OVS |
| (بەركار : بكەر : كار) | OSV |

خشتەی (١/٤): پۆلێنكردنی زمانەكان بەپێی ڕیزبەندی كۆلكەكان

ئێمە لەو باوەڕەداین كە ڕیزبەندی كاری تێنەپەڕیش كەڵكی خۆی هەیە و دەشێت لە ڕۆژێكدا بەكاربهێنرێت. سەبارەت بە زمانی كوردی، دەشێت هەردوو ڕیزبەندەكە بخەینە ڕوو، وەك (SV/SOV). واتە، ئەم زمانەی ئێمە لە كاری (تێنەپەڕ)دا ڕیزبەندی (بكەر، پاشان، كار)ی هەیە و لە كاری (تێپەڕ)دا ڕیزبەندی (بكەر، بەركار، كار)ی هەیە، وەك:

ـ كاری تێنەپەڕ (SV)، وەك:

| بكەر | كار |
|---|---|
| شیلان | خەوت |

ـ كاری بكەر نادیار (تێنەپەڕ)، (SV) وەك:

| جێگری بكەر | كار |
|---|---|
| شیلان | نووسراوە |

ـ كاری (تێپەڕ)، (SOV):

| بكەر | بەركار | كار |
|---|---|---|
| شیلان | نانی | خواردبوو |

ـ كاری (ئاندن)، تێپەڕ (SOV):

| بكەر | بەركار | كار |
|---|---|---|
| شیلان | نامەكەی | سووتاندبوو |

كەواتە، قالبی سۆڤ (SOV) و قالبی سڤ (SV)، هەموو كاری زمانەكە دادەپۆشن. ئەوەش لە یاد نەكەین كە قالبی (SV) بریتیە لە قالبی (SOV) لەپاش فرێدانی هێمای بەركار (O)، كە پێویست نیە بۆ كاری (تێنەپەڕ).

سەبارەت بە پانتایی ڕووبەری بەكارهێنانی ئەو ڕیزبەندانە لە زمانانی جیهاندا، دەبینین كە جیاوازیەكی زۆر هەیە. بۆ نموونە، ئەو قالبانەی كە بە بكەر (S) دەست پێ دەكەن، زۆر بەرفراوان و گشتین، بەتایبەتی قالبی (SOV) كە لە هەموو جۆرەكانی تر بەرفراوانترە و لە هەموویان پتر برشتی هەیە لە زمانانی بەندەی سەرزەویدا. ئەو ڕاستیەیش بە بیر دەخەینەوە كە زمانەكەی ئێمە لە ئەم جۆرەیە. ئێستایش، دەتوانین خشتەیەك پێشكەش بكەین دەربارەی مەودای بەربلاوی لە بەكارهێنانی ئەو ڕیزبەندانەدا، نەخشەی (٢/٤):

| سەرەتا بە... | هێما | پانتایی بەكارهێنان |
|---|---|---|
| بكەر<br>( بكەر ـ لەپێش) | SOV<br>SVO | زۆر زۆر بەربلاوە لە بەكارهێناندا |
| كار<br>(كار ـ لەپێش) | VSO<br>VOS | زۆر كەمتر بەكارهێنراوە، بە بەراورد بە جۆرەكەی سەرەوە. |
| بەركار<br>(بەركار ـ لەپێش) | OVS<br>OSV | ئەم جۆرە ڕیزبەندە زۆر زۆر دەگمەنە، بەتایبەتی (OSV)، كە هێشتا نموونەیەكی پتەوی نیە. |

خشتەی (٢/٤): پانتایی ڕیزبەندەكان لە بەكارهێناندا

سەبارەت بە ئەو زمانانەی كە ئێمە لێیان ئاشناین، دەتوانین ریزبەنـدەكانیان بخەینـە ڕوو، وەك:

- زمانی ئینگلیزی و زمانی فرەنسی، ریزبەندی (SVO).
- زمانی توركی و فارسی، ریزبەندی (SOV).
- زمانی عەرەبی، ریزبەندی (VSO).

لـە ڕاسـتیدا، ئـەم جـۆرە بـەراوردە ئـەنجامێكی كاریگـەر دەدات بـە دەسـتەوە، بـەڵام كێشەیش هـەر دەمێنێـت، چونكە هەنـدێك لـە زمانـەكان بـە جوانی پێوانـە نـاكرێن و لـە هەندێك جۆرە رستەدا ریزبەندێكی تر پیشان دەدەن. یان هەندێك زمانی تـر دوو (بكـەر) هەڵ دەگـرن و دەشـێت (بكـەر)ی یەكـەم لاببردرێـت لـە ڕسـتەكە. بـۆ نموونـە، لـە كوردیـدا دەشێت بكەری (شیلان) لاببەین، وەك:

| | بكەر | بەركار | كار |
|---|---|---|---|
| بكەر پارێزی | شیلان | نامەكەی | ناردوە |
| بكەر بەزێنی | .... | نامەكەی | ناردوە |

لە ئەم بارەدا، قاڵبی (SOV) دەگۆڕێت بە (-OV). كەواتە، هـەر كاتێـك كـە ویستمان قاڵبی زمانی كوردی بدۆزینەوە، دەبێت بكەری (جودا)، واتە بكەری دەربڕاو بە (نـاو)، یـان بـە (جێنـاوی جـودا) ئامـادە بكـەین. لەگـەڵ ئەوەیشـدا، هەنـدێك زمـانی تـر هەیـە كـە مۆرفیمەكانیان لە بنیادی وشەدا تواونەتـەوە و ئـەو زمانانـە لـە ئاسـتی ریزبەنـدی وشـەدا تەمومژ پیشان دەدەن. لە لایەكی تـرەوە، لـە ئـەو پۆلێكردنـەی نێـو نەخشـەی (١/٤)دا، زۆر

دەگمەن و دانسقەیە، كە نموونەی زمانێك هەبێت، كە كۆلكەی (بەركار) بكەوێتە پێش كۆلكەی (بكەر). هەر لە بەر ئەوە، نموونەكانی (VOS, OVS, OSV) نین، یان زۆر زۆر دەگمەنن.

### ٣/٤: زمانێكی بكەربەزێن: (Pro-drop):

یەكێك لە ئاكارەكانی زمانی كوردی ئەوەیە كە (بكەر) كاری ڕستەكەی خۆی نیشان دەكات و دەی نەخشێنێت بە (جێناوی لكاو)، وەك:

(من) نان دەخۆ (م)

(ئێمە) نان دەخۆ (ین)

كەواتە، بكەری ڕستە نوێنەری خۆی هەیە لە بنیادی (كار)دا. بۆ نموونە، هەردوو جێناوی لكاو (م) و (ین) بریتین لە بالێوزی هەردوو جێناوی جودا (من) و (ئێمە) لە بنیادی كارەكەدا. كەواتە، دەتوانین بڵێین: لە زمانی كوردیدا (بكەر)ی ڕستە دوو جار و لە دوو جێدا بۆی هەیە ئامادە بێت لە ڕستەكەی خۆیدا، جارێك بە (ناو) یان بە (جێناوی جودا) و جارێكی تر بە (جێناوی لكاو)، بەڵام بە دوو ڕەفتاری جیاوازەوە، وەك:

**یەكەم:** بكەری جودا، واتە بكەری دەربڕاو بە (ناو) یان بە (جێناوی جودا) شلایەتی پیشان دەدات و دەشێت لابردرێت، وەك:

(من) نان دەخۆ(م) : (ـــ) نان دەخۆ(م)

(ئێمە) نان دەخۆ(ین) : (ـــ) نان دەخۆ(ین)

دووەم: بكەری لكاو، واتە بكەری دەربڕاو بە (جێناوی لكاو)، پتەوایەتی پیشان دەدات و بەهیچ جۆرێك ناشێت لابردرێت و لابردنی دەبێت بەهۆی هەرەسهێنانی ڕستەكە.

كەواتە، ئەو دوو جۆرەی (بكەر) بە كەس و بە ژمارەی كەس ڕێك دەكەون و دەشێت ئەو یەكەیان كە وەك (نیشانە)یەك بنیادی كارەكە دەنەخشێنێت، بە پتەوی بمێنێتەوە و ببێت بە (بەردی بناغە)ی ڕستەكە. بەرانبەر بە ئەوە، بكەری سەرەتای ڕستەكە بۆی هەیە لابچێت، چونكە (هەبوون) و (نەبوون)ی هیچ ناگۆڕێت لە ئەو جێناوە لكاوەی كە بوە بە نوێنەری و كلكی كارەكەی پێ ڕەنگرێژكراوە. ئەم دیاردەیەیش خۆی لە خۆیدا پێی دەگوترێت (Pro-dropy) بە واتای (بكەربەزێنی)، چونكە ڕستەكە بكەری راستەقینەی خۆی دەبەزێنێت و قنیات دەكات بە ئەو جێناوە لكاوەی كە بنیادی كارەكەی نەخشاندوە. لە ڕاستیدا، لە زمانی كوردیدا، دیاردەی (بكەر بەزێنی) هێندە بەربلاوە، هەموو كەلێن و قوژبنێك دەگرێتەوە، چونكە نیشانەی (جێناوی لكاو)ی (بكەر) بریتیە لە نەگۆڕێكی (رەها) و بە ڕەهایی لە بنیادی كاردا فەرمانڕەوایی دەكات. هەر لەبەر ئەوە، لەگشت ڕووبەرەكانی ڕێزماندا دیاردەی (بكەر بەزێنی) بە وردی دەچەسپێت، وەك:

**یەكەم: دەمكاتی ڕانەبردوو:**

**- كاری تێنەپەڕ، وەك:**

(من) دەڕۆم : ( - ) دەڕۆم

(تۆ) دەڕۆیت : ( - ) دەڕۆیت

(ئەو) دەڕوات : ( - ) دەڕوات

(ئێمە) دەڕۆین : ( - ) دەڕۆین

(ئێوە) دەڕۆن : ( - ) دەڕۆن

(ئەوان) دەڕۆن : ( - ) دەڕۆن

- كاری تێپەڕ، وەك:

(من) دەنووسم : ( ـ ) دەنووسم

(تۆ) دەنووسیت : ( ـ ) دەنووسیت

(ئەو) دەنووسێت : ( ـ ) دەنووسێت

(ئێمە) دەنووسین : ( ـ ) دەنووسین

(ئێوە) دەنووسن : ( ـ ) دەنووسن

(ئەوان) دەنووسن : ( ـ ) دەنووسن

دووەم: فەرمانی راستەوخۆ:

- كاری تێنەپەڕ، وەك:

(تۆ) بخەوە : ( ـ ) بخەوە

(ئێوە) مەخەون : ( ـ ) مەخەون

- كاری تێپەڕ، وەك:

(تۆ) نامە بنێرە : ( ـ ) نامە بنێرە

(ئێوە) نامە بنێرن : ( ـ ) نامە بنێرن

سێیەم: دەمكاتی رابردوو، وەك:

(من) رۆیشتم : ( ـ ) رۆیشتم

(تۆ) رۆیشتیت : ( ـ ) رۆیشتیت

(ئەو) رۆیشت : ( ـ ) رۆیشت

(ئێمە) رۆیشتین : ( ـ ) رۆیشتین

(ئێوە) ڕۆیشتن : ( ـ ) ڕۆیشتن

(ئەوان) ڕۆیشتن : ( ـ ) ڕۆیشتن

ـ كاری تێپەڕ، وەك:

(من) نووسیم : ( ـ ) نووسیم

(تۆ) نووسیت : ( ـ ) نووسیت

(ئەو) نووسی : ( ـ ) نووسی

(ئێمە) نووسیمان : ( ـ ) نووسیمان

(ئێوە) نووسیتان : ( ـ ) نووسیتان

(ئەوان) نووسییان : ( ـ ) نووسییان

بە هەمان شێواز، هەر سێ جۆرەكەی تری ڕابردوو ئەم بكەر بەزێنیە پەسەند دەكەن، وەك:

ـ ڕابردووی بەردەوام:

(من) دە ڕۆیشتم : ( ـ ) دەڕۆیشتم

(من) دەم نووسی : ( ـ ) دەم نووسی

ـ ڕابردووی دوور:

(من) ڕۆیشتبووم : ( ـ ) ڕۆیشتبووم

(من) نووسیبووم : ( ـ ) نووسیبووم

ـ ڕابردووی تەواو:

(من) ڕۆیشتووم : ( ـ ) ڕۆیشتووم

(من) نووسیومە : ( ـ ) نووسیومە

تەنانەت، كاری (ئاندن) و (بكەر نادیار)یش، دیاردەی (بكەر بەزێنی) پەسەند دەكەن، وەك:

ـ كاری (ئاندن)، تێپەڕ:

(من) سووتاندم : ( ـ ) سووتاندم

(تۆ) سووتاندت : ( ـ ) سووتاندت

(ئەو) سووتاندی : ( ـ ) سووتاندی

(ئێمە) سووتاندمان : ( ـ ) سووتاندمان

(ئێوە) سووتاندتان : ( ـ ) سووتاندتان

(ئەوان) سووتاندیان : ( ـ ) سووتاندیان

ـ كاری (بكەر نادیار)، تێنەپەڕ:

(من) نووسرام : ( ـ ) نووسرام

(تۆ) نووسرایت : ( ـ ) نووسرایت

(ئەو) نووسرا : ( ـ ) نووسرا

(ئێمە) نووسراین : ( ـ ) نووسراین

(ئێوە) نووسران : ( ـ ) نووسران

(ئەوان) نووسران : ( ـ ) نووسران

**چوارەم:** لەرووبەری كاری (بوون و هەبوون)دا:

لە رووبەری كاری بوون و هەبووندا هەمان میكانیزم هەیە و دەشێت بكەری ڕستەكە فڕی بدەین، وەك:

- رانەبردوو:

(من) جوانم : ( ـ ) جوانم

(من) هە م : ( ـ ) هەم

- رابردوو:

(من) جوان بووم : ( ـ ) جوان بووم

(من) هە بووم : ( ـ ) هەبووم

**٤/٤: دوور لە بكەربزێنی:**

بە راستی زمانەكەمان بە جۆرێك بكەربەزێنە كە زۆر ئەستەمە چەند نموونەیەك بدۆزیتەوە, كە نەفرین بكەن لە دیاردەی (بكەبەزێنی). لە ئەم روانگەیەوە, دەتوانین هەڵوەستەیەك بكەین لە ئاستی ئەو رووبەرە بچووكانەی كە میكانیزمی (بكەر بەزێنی)یان تێدا ناچەسپێت. بۆ نموونە, لە وردیلەترین سێتە رێژەی كاری (بوونی ئێستایی)دا، لە رووبەرێكی زۆر زۆر هورد و بەرتەسكدا، دیاردەی ( بكەر بەزێنی) ناچەسپێت و رێژەكان دەبن بە (بكەرپارێز), وەك:

(من) م : ( ـ )م*

(تۆ) یت : ( ـ )یت*

(ئەو) ە : ( ـ )ە*

(ئێمە) ین : ( ـ )ین*

(ئێوە) ن : ( ـ )ن*

(ئەوان) ن : ( ـ )ن*

بە سەرنجێکی هورد لە ڕیزە رووتەكانی (بوون)، كە بریتین لە ئەوانەی (دەستە ڕاست)، دەر دەكەوێت كە ناتوانین بكەری ڕستەكە لابدەین. هەر لەبەر ئەوە، هێمای ئەستێرە (*) دانراوە بۆ ڕیزەكانی (دەستە چەپ)، چونكە خاپوور دەبن بە لابردنی (بكەری جودا). بە هەمان شێوە، لە ڕستەی (نیازداری) و (گوماناداری)دا ئەو دیاردەیە ناچەسپێت، وەك:

با (من) بام ؛ با ( ـ )بام *

رەنگە (من) بم ؛ رەنگە ( ـ )بم*

## ٥/٤: پۆلێنكردنی وشەسازیانە:

لە سەر بنەمای مۆرفۆلۆژی ( وشەسازی)، زمانانی بەندەی سەر زەوی بە جۆرێکی تر پۆلێنكراون. لە ئەو پۆلێنكردنەدا تێكهەڵكێشكردنی مۆرفیمەكان، لە بنیادی وشەدا، خراوەتە بەر بایەخ و لە ئەنجامدا سێ شاجۆر لە زمان پەیدابوە، وەك:

**یەكەم: زمانی دابڕاو (Isolating Language).**

واتە، ئەوا زمانانەی كە زۆربەی وشەكانی لە یەك مۆرفیم پێك هاتوە و لەنێوان مۆرفیمەكانـدا (كەلێن) هەیە. بۆ نموونە، لە زمانی ئینگلیزیدا ئەو جۆرە تێكبەستە برەوی زۆرە و هەر لەبەر ئەوە دەشێت بە زمانێکی (دابڕاو) ناوزەد بكرێت.

**دووەم: زمانی نووسەكی (Agglutinative language).**

واتە، ئەو زمانەی كە لە بنیادی وشەدا، مۆرفیمەكانی لەدوای یەك ریز دەبن و ریزبەندێکی (خانەبەندی) پێك دەهێنن. لە جۆرە زمانی ئاوهادا، مۆرفیمەكان دەڵێیت بە كەتیرە نووساون بە یەكتریەوە. نموونەیەك بۆ زمانی نووسەكی بریتیە لە زمانی (توركی)

و زمانی (سەواحیلی). بە راستی، سیمای پێكەوە نووسی زاڵە بە سەر زمانی كوردیدا، چونكە مۆرفیمەكانی كار و رستە ریز دەبەستن و دەشێت خانەڕێز بكرێن، وەك لە سەراپای ئێشەكانی ئێمەدا پەیڕەوكراوە[9]. تەنانەت، فۆنیمەكانی بڕگەیش خانەچنكراون[10].

### سێیەم: زمانی تێكتواوە (Fusional language).

لە ئەم جۆرە زمانەدا، مۆرفیمەكان لە بنیادی وشەدا دەتوێنەوە بە یەكتریدا و بە ئاسانی ناناسرێنەوە، یان لە یەكتری داناژەنرێن. ئەم پۆلێنكردنە، هەر چەندە كاریگەری خۆی هەبێت، بەڵام رەخنەی لەسەر هەیە، چونكە زمانەكان تێكەڵاوی پیشان دەدەن. بۆ نموونە، زمانی ئینگلیزی ئەگەر ئامار بكرێت لە جۆری یەكەم دەردەچێت (زمانی دابڕاو)، بەڵام لە جۆرەكانی تریشی تێدا هەیە. لە ئەم رووەوە وشەی (faith-full-ness) سیمای زمانی (نووسەكی) پیشان دەدات، چونكە مۆرفیمەكانی پێكەوە نووساون و ریزبەندێكی خانەییان چێكردوە و دەشێت هەر مۆرفیمێك بە ئاسانی بناسرێتەوە. یان، لە وشەیەكدا وەك (went) سیمای زمانی تێكتواوە هەیە، چونكە نیشانەی رابردوو بە جۆرێك تواوەتەوە كە جودا ناكرێتەوە. لەلایەكی ترەوە، گرووپی سێیەم (تێكتواوە) پۆلێنكراوە بۆ سێ لاپۆل، كە پێویست ناكات لە ئێرەدا باسی بكەین.

سەبارەت بە زمانی كوردی، سیمای (نووسەكایەتی) زۆر بەربڵاوە و مۆرفیمەكان بە جوانی ریز دەبن و پلیكانە دروست دەكەن. ئەم دیاردەیە لە گشت ئیشەكانی ئێمەدا باس

---

[9] لە یەكەم نووسینەوە، لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە پلیكانەی رستە بڵاوكراوەتەوە. بڕوانە بۆ بەشی یەكەم لە كتێبی (٣٦)، لە لیستی كتێبەكاندا.

[10] لە ساڵی (٢٠١٢)ەوە، نەخشەی بنیادی بڕگە بە تەواوی بە (دوو خانە و دوو گیرفان) بڵاوكراوەتەوە. بڕوانە بۆ بەشی هەفتەم لە كتێبی (٤٧)، لە لیستی كتێبەكاندا.

گراوە و تەنانەت ریزبەندی خانەكانیش ژمارە رێزكراوە و پلیكانەیەك دروست كراوە بۆ رستەی زمانی كوردی، وەك:

**بریا نەسووتێنرا بووبا**

كە دەشێت مۆرفیمەكان بە ئەم چەشنە جودا بكرێنەوە:

**بریا | نە | سووت | ێن | ر | ا | بوو | با**

لە ئیشەكانی ئێمەدا، ئەو مۆرفیمانە كراون بە پلیكانەیەكی خانەخانە، وەك:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | +٢ | سفر | -١ | -٢ | -٣ | -٤ | -٥ |
| بریا | نە | سووت | ێن | ر | ا | بوو | با |

لە راستیدا، گشت ئیشەكانی ئێمە لەسەر (پلیكانەی رِستە)، بریتین لە سەلمێنەری ئەوەی كە زمانی كوردی لەژێر ركێفی (پێكەوە نووسی)دایە، چونكە مۆرفیمەكان هەر چەند وەك ( موسنەك) پێكەوە نووسان، بەلاّم بە ئاسانی جودا دەكرێنەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو دیاردەی پێكەوەنووسانە هەل و مەرجی دەنگسازی خۆی هەیە, چونكە دوو مۆرفیمی هاوجەمسەر دەشێت تەشەنەی دەنگسازیانە لە جەمسەری یەكتری بكەن، بەلاّم بە كارلێكێكی روون و زەلاڵ, وەك:

**یەكەم:** لە هەندێك جێدا، دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی) دەچەسپێت، وەك:

**شیلان [سووت ـ ان ـ د ـ ی]**

**شیلان [هێن ـ ا ـ ی]**

لە ئەو دوو نموونەیەدا، مۆرفیمی (ی) جارێك بە (بزوێن) دەردەكەوتوە و جارێكی تر بە (نەبزوێن).

دوەم؛ لە گشت جێیەكدا، نیشانەی رابردوو (د) رەگەزی تێپەڕاندن (ێن) دەگۆڕێت بە (ان)، وەك:

دە [سووت ـ ێن ـ م]

[سووت ـ ێن ـ ر ـ ا ـ بوو]

[سووت ـ ێن ـ ر ـ ا ـ و ـ ە]

[سووت ـ ان ـ د ـ بوو ـ م]

[سووت ـ ان ـ د ـ م]

لە دوو نموونەكەی دواییدا، رەگەزەی (ێن) روخساری گۆڕیوە بۆ (ان)، چونكە نیشانەی رابردوە بریتیە لە دەنگی (دال).

سێیەم؛ هەندێك جار، هەل و مەرجی فۆنۆلۆژی وا دەكات كە كەلێنی نێوان دوو مۆرفیم پڕ بكرێتەوە، وەك:

من دە [رۆ ـ م]

من دە [رۆ (یشـ) ـ ت ـ م]

لە نموونەی دوەمدا، هاتنی نیشانەی رابردوو (ت) وای كردوە كە هەندێك دەنگی (نێوانگر) پەیدا ببێت، تا بە جوانی بە یەكەوە بنووسێن.

چوارەم؛ لە كاری تێنەپەڕی ئەلفیدا، وەك (سووتان)، یان (سووتێنران)، نیشانەی رابردوو (ا) دەگۆڕێت بۆ نیشانەی رانەبردوو (ێ)، وەك:

لە ئەو دوو نموونەیەدا، مۆرفیمی (ی) جارێك بە (بزوێن) دەردەكەوتوە و جارێكی تر بە (نەبزوێن).

دوەم: لە گشت جێیەكدا، نیشانەی رابردوو (د) ڕەگەزی تێپەڕاندن (ێن) دەگۆڕێت بە (ان)، وەك:

دە [سووت ـ ێن ـ م]

[سووت ـ ێن ـ ر ـ ا ـ بوو]

[سووت ـ ێن ـ ر ـ ا ـ و ـ ە]

[سووت ـ ان ـ د ـ بوو ـ م]

[سووت ـ ان ـ د ـ م]

لە دوو نموونەكەی دواییدا، ڕەگەزەی (ێن) روخساری گۆڕیوە بۆ (ان)، چونكە نیشانەی رابردوە بریتیە لە دەنگی (دال).

سێیەم: هەندێك جار، هەل و مەرجی فۆنۆلۆژی وا دەكات كە كەلێنی نێوان دوو مۆرفیم پڕ بكرێتەوە، وەك:

من دە [ڕۆ ـ م]

من دە [ڕۆ (یشـ) ـ ت ـ م]

لە نموونەی دوەمدا، هاتنی نیشانەی رابردوو (ت) وای كردوە كە هەندێك دەنگی (نێوانگر) پەیدا ببێت، تا بە جوانی بە یەكەوە بنووسێن.

چوارەم: لە كاری تێنەپەڕی ئەلفیدا، وەك (سووتان)، یان (سووتێنران)، نیشانەی رابردوو (ا) دەگۆڕێت بۆ نیشانەی رانەبردوو (ێ)، وەك:

من دەنووسر|ام ؛ من دەنووسر|ێم

یان:

من دەسووت|ام ؛ من دەسووت|ێم

لە گەڵ گشت ئەو دیاردە دەنگسازیانەدا، سیما (نووسەكایەتی) بە ئاشكرا دیارە بە ئەو وشانەوە كە لەسەر بنجی كارێك ڕۆنراون، وەك:

نووسینگە: [نووس ـ یـ ـ ن ـ گە]

نووسەر: [نووس ـ ەر]

نووسەرەكان: [نووس ـ ەر ـ ەكە ـ ان]

پێنووس: [پێ ـ نووس]

نووسراو: [نووس ـ ر ـ ا ـ و]

لە گۆشەنیگای زمانی نووسەكیەوە, كە بە سەر زمانی كوردیدا زاڵە, (د. وریـا عومـەر ئەمین) پێی وایە كە زمانی كوردی لـە جـۆرێكی وردتـرە, كـە بـە (Incorporatig), یـان (Polysynthetic) ناسـراوە, وەك نموونـەی (رامـان نـە گرتبوویـت). ئـەم رسـتەیە بـە ئاسـانی بـە خانـەكانی پلیكانـەی رسـتە شـانە دەكرێـت و مۆرفیمـەكانی بـە ئاسـانی دەناسـرێنەوە و بـە وردی جـودا دەكرێنـەوە لـە یـەكتری, چـونكە سیمای زمـانی نووسـەكی (Agglutinative) زاڵـە بـە سـەر زمـانی كوردیـدا, (وەك لـە خـوارەوە خانەچـنكراوە). هـەروەها, مامۆسـتای خوالێخۆشـبوو (د. محەمـەد مـەعرووف فـەتتاح) دەڵێـت, بـە زۆری زمانی كوردی لە جۆری (نووسەكی) نزیكە.

| ٣+ (٦-) | ٢+ | سفر | ٣- | ٤- | (٦-) | ٧- |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| رامان | نە | گر | ت | بوو | | یت |

لە پلیكانەی ڕستەی زمانەكەدا، تەنها دوو مۆرفیم تێك دەتوێنەوە و جودا ناكرێنەوە، وەك نیشانەی نەرێ (نە) لە خانەی (+٢) و پێشكاری بەردەوامی (دە، بـ) لە خانەی (+١)دا. ئەوەیش بە شێوەیەكی پارچەیی روو دەدات، نەك بە شێوەیەكی سەرتاسەری[١١].

## ٦/٤: زمانی كوردی زمانێكی ئێرگەتیڤ[١٢]:

لە ڕێزمانی دۆخدا، دەشێت (دۆخی بكەر) و (دۆخی (بەكار) جودا بكەینەوە لە ڕستەدا. بۆ نموونە، لە ڕستەیەكدا، وەك: (I saw him )، جێناوی كەسی یەكەمی تاك (I) لە دۆخی (بكەر)دایە و بە هیچ جۆرێك، بە ئەو روخسارەیەوە، ناتوانێت ببێت بە (بەركار). لە بەرانبەردا، جێناوی كەسی سێیەمی تاك (him) لە رۆڵی (بەركار)دایە و بە هیچ جۆرێك، بە ئەو روخسارەیەوە، ناتوانێت ببێت بە (بكەر). واتە، جێناوی (he) نیشانكراوە و روخسارەكەی كراوە بە (him) بۆ ئەوەی مۆركی رۆڵی بەركاری پێوە دیار بێت. ئێستاش ئەگەر رۆڵی (بكەر) و رۆڵی (بەركار) بكەین بە پێچەوانە، وەك: (He saw

[١١] بۆ زانیاری پتر لە سەر ئەم بابەتە، بڕوانە بۆ (بابەتی دوەم) لە پێشەوە.

[١٢] بۆ زانیاری وردتر و كاریگەرتر و بەرفراوانتر لە سەر بابەتی (سیستمی ئێرگەیتیڤ لە زمانی كوردیدا)، بڕوانە بۆ بەشی دوەم لە كتێبی (ڕێزمانی بوون و هەبوون لە شرۆڤەكاری ڕێز انیدا/ هەولێر ٢٠١٥). هەروەها بڕوانە بۆ هەردوو بابەتی چوارەم و دەیەم لە كتێبی (پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی جێناوی/ هەولێر ٢٠١٥).

me), دەبینین مۆرکی دۆخی (بەرکار) جێناوی کەسی یەکەمی تاکی گۆڕیوە بۆ (me) و لە هەمان کاتدا مۆرکی (بکەر) جێناوی کەسی سێیەمی تاکی گۆڕیوە بۆ (he)، وەك:

- (جێناو + مۆرکی بکەری) ؛ (I, he)
- (جێناو + مۆرکی بەرکاری) ؛ (me, him)

کەواتە، هەر دوو جێناوی (I) و (me) دەگەڕێنەوە بۆ کەسی یەکەمی تاك، بەڵام بە دوو ڕوخساری جیاواز بۆ دوو (دۆخ)ی تایبەت، کە بریتین لە ڕۆڵی (بکەر) و لە ڕۆڵی (بەرکار). ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە ڕێزمانی دۆخ (Case Grammar) ناسراوە و زمانی (ئینگلیزی) بریتیە لە نموونەیەك لە ئەم جۆرە ڕێزمانە. لە لایەکی ترەوە, بە شێوازێکی زۆر کاریگەر و یەکلاییکەرەوە, (M. Tallerman-2011) زمانانی بەندەی سەر زەوی دابەشکردوە بە سەر دوو سیستمدا:

یەکەم: دۆخی (بکەر - بەرکاری) (Nominative-accusative). لە ئەم سیستمەدا, بنەمایەك دەچەسپێت لە چەشنی:

$$S = A \neq O$$

بۆ ڕاڤەکردنی ئەو هاوکێشەیە, لە نەخشەی (٣/٤)دا, سێتە جێناوی (م, یت, ێت, ین, ن, ن) دەبێت بە بکەری تێنەپەڕ (S), لە کاری (خەوتن)دا, هەروەها دەبێت بە (بکەر)ی تێپەڕ (A) لە کاری (نووسین)دا, بەڵام ئەو جێناوەی کە دەبێت بە بەرکار (O) لە کاری

تێپەڕی (نووسین)دا جیاوازە (م, ت, ی, مان, تان, یان). سەبارەت بە زمانی كوردی, لە دەمكاتی (رانەبردوو)دا ئەم سیستمە دەچەسپێت, چونكە بكەری كاری تێنەپەڕ یەكسانە بكەری كاری تێپەڕ. واتە, لە رانەبردوودا ئەو دوو كۆلكەیە پەنا دەبەن بۆ سێتە جێناوی (م, یت, ێت, ین, ن, ن). ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە لە دەمكاتی رانەبردوودا زمانەكەمان لە جۆری بكەرسالارە (Accusative), چونكە روخساری سێتە جێناوی (م, یت, ێت, ین, ن, ن) مۆركی (بكەر)ی پێوەیە و لێ نابێتەوە, بەلام سێتە جێناوی (م, ت, ی, مان, تان, یان) مۆركی (بەركار)ی پێوەیە. لە رژێمی زمانی ئنگلیزیدا بە گشتی، كە لە ئەم سیستمەیە, هەردوو جێناوی (I , He) لە دۆخی (بكەری)دان و هەردوو جێناوەكەی تر (me , him) لە رۆڵی (بەركاری)دان. لە زمانی كوردیدا، ئەو جۆرە رژێمە (ئەكیووزەیتیڤ) هەر لە (دەمكاتی رانەبردوو)دا بڕەی هەیە, بەلام لە (دەمكاتی رابردوو)دا دەگۆڕێت بە سیستمی ئەركسالاری (ئیرگەیتیڤ). لە لایەكی ترەوە, جێناوی جودا, لە چەشنی (من) و لە چەشنی (ئەو) ، ئەو رژێمە پەیڕەو ناكەن و دەتوانن بچنە نێو دۆخی (بكەر) و دۆخی (بەركار)ەوە، بەبێ ئەوەی روخساریان مۆركاوی بكرێت، وەك:

**(من) (ئەو) دەبینم، (ئەو) (من) دەبینێت**

| S = A ≠ O: Accusative System | |
|---|---|
| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
| بکەر - (S) | بەرکار - (O) : بکەر - (A) |
| من دە خەو (م) | من دە (ی) نووس (م) |
| تۆ دە خەو (یت) | تۆ دە (م) نووس (یت) |
| ئەو دە خەو (ێت) | ئەو دە (ت) نووس (ێت) |
| ئێمە دە خەو (ین) | ئێمە دە (یان) نووس (ین) |
| ئێوە دە خەو (ن) | ئێوە دە (مان) نووس (ن) |
| ئەوان دە خەو (ن) | ئەوان دە (تان) نووس (ن) |

نەخشەی (٣/٤): سیستمی (ئەكیووزەیتیڤ) لە ڕانەبردوودا.

**ڕژێمی دووەم: دۆخی (ئەرگسالاری - ڕەهایی) (Ergative-absolutive case).** لە ئەم سیستمەدا، بنەمایەك دەچەسپێت، وەك:

$$S = O \neq A$$

بۆ ڕاڤەکردنی ئەو هاوكێشەیە، لە نەخشەی (٤/٤)دا، سێتە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن) دەبێت بە بکەری تێنەپەڕ (S)، لە کاری (خەوتن)دا و هەروەها دەبێت بە بەرکار(O) لە کاری (نووسین)دا، بەڵام ئەو جێناوەی کە دەبێت بە بکەری تێپەڕ (A) لە کاری تێپەڕی (نووسین)دا جیاوازە (م، ت، ی، مان، تان، یان). لە زمانی کوردیدا، لە دەمکاتی (ڕابردوو)دا ئەم سیستمە تازەیە (ئێرگەیتیڤ) دەچەسپێت، چونکە (بەرکاری ڕانەبردووی تێنەپەڕ

یەكسانە، بە جێناو، بە (بە بكەری ڕابردووی تێپەڕ). واتە، ئەو دوو كۆلكەیە پەنا دەبەن بۆ سێتە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) و دەی خەنە بە زەبری ئەگگۆڕكێ. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە، بە بەراورد لە گەڵ دەمكاتی ڕانەبردوودا، لە دەمكاتی ڕابردوودا سیستەمی زەمانەكەمان دەگۆڕێت بە جۆری ئەركسالاری (Ergative System)، چونكە (ئەرك)ی سێتە جێناوەكان گرنگترە و سەنگینترە لە (ڕوخسارە دەنگیەكە)یان. لە ئەم ڕووبەرەدا، سێتە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) مۆركی (بەركار) دەدۆڕێنێت و دەبێت بە بكەری تێپەڕ (A)، بەڵام سێتە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن) بە ناچاری مۆركی (بەركار)یش وەر دەگرێت. بۆ نموونە، لە دەمكاتی ڕابردووی زمانی كوردیدا، پۆلە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن) دەبێت بە (بكەر) لە كاری تێنەپەڕدا (S). بە هەمان شێوە، هەمان ڕیزە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن)، بە هەمان ڕوخسارەوە، دەبێت بە (بەركار) لەكاری تێپەڕدا (O).

S = O ≠ A:
Ergative System

| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|
| بكەر - (S) | بكەر - (A) : بەركار - (O) |
| من دە خەوت (م) | من دە (م) نووسی (ی) |
| تۆ دە خەوت (یت) | تۆ دە (ت) نووسی (م) |
| ئەو دە خەوت (ێت) | ئەو دە (ی) نووسی (یت) |
| ئێمە دە خەوت (ین) | ئێمە دە (مان) نووس (ن) |
| ئێوە دە خەوت (ن) | ئێوە دە (تان) نووس (ین) |
| ئەوان دە خەوت (ن) | ئەوان دە (یان) نووس (ن) |

نەخشەی (٤/٤): سیستەمی (ئێرگەیتیڤ) لە ڕابردوودا.

وەك پوختەیەك بۆ ئەوەی كە باسكرا، دەتوانین چەند سەرنجێكی ورد تۆمار بكەین بۆ ئەو تویژەرە زرنگانەی كە بە بلیمەتی لە ڕێزمانی كوردی ورد دەبنەوە[12]، وەك:

(١): لە پێكهاتەی ڕستەدا سێ كۆلكەی جیاواز هەیە بۆ سێ ئەركی ڕێزمانی، وەك: بكەری تێنەپەڕ (S)، بكەری تێپەر (A)، بەركار (O)، بەڵام دوو سێتەجێناوی جیاواز هەیە، وەك سێتی یەكەم (م، یت، ێت، ین، ن، ن) و سێتی دووەم (م، ت، ی، مان، تان، یان). كەواتە، دەبێت ئەو دوو سێتە جێناوە بە سفتی دابەش بكرێت بە سەر ئەو سێ كۆلكە ڕێزمانیەدا.

(٢): لە ڕووی دابەشبوونی ئابووریانەوە، بكەری تێپەر (A) و بەركار (O) هەردەم دەتوانن لە یەك ڕستەدا كۆ ببنەوە. كەواتە هەردوو كۆلكەكە دەبێت (جیاواز) بن بە ڕوخساری جێناو، بە ڕێسای (A≠ O). واتە، بكەری تێپەڕ (A) و بەركار (O) هەردوو سێتە جێناوەكە فۆرخ دەكەن بۆ خۆیان، وەك: سێتی یەكەم (م، یت، ێت، ین، ن، ن) بۆ بكەری تێپەڕ (A). پاشان سێتی دووەم (م، ت، ی، مان، تان، یان) بۆ بەركار (O).

(٣): بە كورتی، جێگەی بكەری تێنەپەر (S) نامێنێتەوە، چونكە هەردوو سێتە جێناوەكەی لێ زەوت دەكرێت، لە لایەن بكەری تێپەڕ (A) و بەركارەوە (O). لە ئەم هەڵوێستەدا، دوو (گریمانە) دەكەونە بەردەم بكەری تێنەپەر (S): یان دەبێت یەكسان بێت بە بكەری تێپەڕ (S=A)، یان دەبێت یەكسان بێت بە بەركار (S=O).

(٣): لە گریمانەی یەكەمدا، بكەری تێنەپەڕ (S) و بكەری تێپەر (A) هەرگیز ناتوانن لە یەك ڕستەدا كۆ ببنەوە، چونكە هەر ڕستەیەك یان تێپەڕە یان تێنەپەڕ. كەواتە، هەردوو كۆلكەكە دەشێت یەكسان بن بە جێناو، یان (S = A). ئەم گریمانەیە، سیستمی (Accusative) بەرپا دەكات، وەك (S=A≠O). بە واتایەكی ڕوونتر، بكەری تێنەپەڕ

[12] لە ئەم خاڵانەدا كەڵك وەرگیراوە لە كتێبەكەی (M. Tallerman-2011, chapter 6).

(S) و بكەری تێپەر (A) یەك سێتە جێناویان دەبێت، وەك سێتی یەكەم (م، یت، ێت، ین، ن، ن)، بەڵام سێتە جێناوی بەركار (O) بە جیاوازی دەوەستێت، وەك سێتی دووەم (م، ت، ی، مان، تان، یان). ئەم راستیە لە سەر نەخشەی (٣/٤) روونكراوەتەوە. لە دەمكاتی رانەبردوودا، بە یەكسانی لە گەڵ هەر سێ زمانی (ئنگلیزی، فەرەنسی، عەرەبی) و زۆربەی زمانەكانی تر، زمانی كوردی ئەم سیستمە پەیرەو دەكات. لە دەمكاتی رابردوویشدا، ئەو سێ زمانە و زۆربەی زۆری زمانەكانی تر، سیستمی ئەكیووزەتیف (S=A≠O) پیادە دەكەن، بەڵام لە رابردوودا، زمانی كوردی لامل دەوەستێت و سیستمی (ئێرگەیتیف) پەیرەو دەكات.

(٤): لە دەمكاتی رابردوودا، وەك زمانی كوردی سیستمی ئەكیووزەتیف پەسەند ناكات، بە ناچاری دەبێت گریمانەی دووەم بپەژرێنێت. لە ئەم گریمانەیەدا، بكەری تێنەپەڕ (S) و بەركار (O) هەرگیز ناتوانن لە یەك رستەدا كۆ ببنەوە، چونكە رستەی تێنەپەڕ بەركاری (O)ی ناوێت. كەواتە، هەردوو كۆڵەكە دەشێت یەكسان بن بە روخساری جێناو، یان (O = S). ئەم گریمانەیە سیستمی ئەركسالاری (Ergative) بەرپا دەكات، وەك (S=O≠A). بە واتایەكی روونتر، پرۆسەی ئەركگۆڕین دەچەسپێت و بكەری تێنەپەڕ (S) و بەركار (O) یەك سێتە جێناویان دەبێت، وەك سێتی یەكەم (م، یت، ـ، ین، ن، ن)، بەڵام سێتە جێناوی بكەری تێپەڕ (A) جیاواز دەوەستێت، وەك سێتی دووەم (م، ت، ی، مان، تان، یان). ئەم راستیە لە سەر نەخشەی (٤/٤) روونكراوەتەوە. كەواتە، لە دەمكاتی رابردوودا زمانی كوردی ئەفرین دەكات لە سیستمی ئاسایی (ئەكیووزەتیف) و سیستمی نامۆی (ئێرگەیتیف) پەیرەو دەكات.

(٥): لە زمانی كوردیدا، تەوەری سیستمی ئێرگەیتیف لە سەر سێتە جێناوی دووەم (م، ت، ی، مان، تان، یان) دەگەڕێت، چونكە لە نێوان هەردوو دەمكاتی (رانەبردوو و رابردوو)دا

ئەركی ڕێزمانی ئەم سێتە جێناوە دەگۆڕێت لە (بەركار)ەوە بۆ (بكەر). لە بەرانبەردا, سێتە جێناوی یەكەم (م, یت, ـ, ین, ن, ن) ئەو بۆشاییە پڕ دەكاتەوە كە سێتی یەكەم بە جێی هێشتوە.

(٦): ئەو جیاوازیەی كە بە سێتە جێناوی یەكەمەوە (م, یت, ـ, ین, ن, ن) دەركەوتوە و جێناوی كەسی سێیەمی تاك بوە بە (نادیار) هیچ پەیوەندیەكی نیە بە سیستەمی ئێرگەیتیڤەوە. ئەم جێناوە نادیارە لە سەرپاكی ڕێزمانی (بوون و هەبوون)دا لە دایك دەبێت و بە (میكانیزمی ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردوو) دەپەڕێتەوە بۆ نێو سیستەمی ئێرگەیتیڤ.

(٧): بە پێی خاڵی پێشوو, زێدی یەكەمی سیستەمی زمان لە ڕانەبردووی كاری (بوون و هەبوون)دایە. واتە, ئەگەر (بوون و هەبوون) سیستەمی نەكیووزەیتیڤی گوزەراند, ئەوا دەمكاتی (ڕابردوو)یش دەبێت بە نەكیووزەیتیڤ, یان, ئەگەر (بوون و هەبوون) سیستەمی ئێرگەیتیڤی گوزەراند, ئەوا دەمكاتی (ڕابردوو)یش لە سەر هەمان سیستەمی ئێرگەیتیڤ شەكل دەبێت. بە كورتی, زێدی یەكەمی سیستەمی زمان (نەكیووزەیتڤ یان ئێرگەیتیڤ) لە دەمكاتی ڕانەبردووی ڕێزمانی (بوون و هەبوون)دایە و لەوێدا سەری دەجووڵێت و لە ئەوێوە بڵاو دەبێتەوە بە دەمكاتی ڕابردووی زمانەكەدا.

(٨): وەك پوختەیەك بۆ خاڵی پێشوو, لە زمانە ئێرگەیتیڤەكاندا (وەك كوردی), سەرتاپای ڕێزمانی بوون و هەبوون لە جۆری ئێرگەیتیڤە, بەڵام لە كارە ئاساییەكاندا هەر دەمكاتی ڕابردوو لە جۆری ئێرگەیتیڤە. لە بەرانبەردا, لە زمانە نەكیووزەیتیڤەكاندا, سەرتاپای ڕێزمانی بوون و هەبوون و كارە ئاساییەكان لە هەردوو دەمكاتی ڕانەبردوو و ڕابردوودا لە جۆری نەكیووزەیتیڤە. كەواتە, زۆر سەخت و ئاسێ دەبێت بۆ كەسێك, كە زمانی دایكی لە جۆری نەكیووزەیتیڤ بێت, زمانێكی دووەم فێر ببێت, كە لە جۆری

ئیرگەیتیڤ بێت, چونكە دەبێت هەردوو سیستەمەكە هەرس بكات. ئەم بۆچوونە ڕەنگە پێچەوانەكەیشی ڕاست بێت.

بۆ نموونە, ئەو ڕێزماننووسانەی سەدەی بیستەم, وەك لە سەرچاوەكاندا ناویان هاتوم, باسی ڕێزمانی جێناو و ئەركگۆڕێی جێناو دەكەن, بەلاّم كێشەكە ناكەن بە (بابەت) و لە سەر سیستمی (ئیرگەیتیڤ) نادوێن, كە دەبا لە یەكەم هەنگاوەوە باسی بكەن, چونكە جێناو تەوەری ئەم سیستەمیە و زمانەكەی ئێمەیش لە جۆری ئەم سیستەمە نامۆیەیە.

## ٧/٤: سروشتی زمانی كوردی:

لە زمانی كوردیدا, لەوانەیە لە گشت زمانەكاندا, سیستمی (ئیرگەیتیڤ) لە ڕانەبردووی كاری (بوونی ئێستایی)دا لە دایك بوە و بنەجێ بوە, وەك لە چارەكی دوەمی نەخشەی (٥/٤) نیشاندراوە. ئەو نەخشەیە گشت ڕووبەرەكانی زمانەكە دەگرێتەوە و بە سەرنجێكی وردیش دەردەكەوێت كە:

**یەكەم:** لە چارەكی یەكەمدا (لای ڕاست) زمانەكەی ئێمە لە جۆری نەكیووزەیتیڤە, چونكە بنەمای ئەو سیستمە چەسپاوە, وەك ($S = A \neq O$). واتە, بكەری كاری تێنەپەڕ و تێپەڕ یەك سێتە جێناوی هەیە (م، یت، ێت، ین، ن، ن), بەلاّم جێناوی (بەركار) جیاوازە بە ڕوخسار, وەك: (م, ت, ی, مان, تان, یان).

**دوەم:** سیمای (ئیرگەتیڤ) لە چارەكی دوەمدا هاتوەتە ئاراوە (لای چەپ), چونكە (بەركار)ی كاری ڕانەبردووی تێپەڕ (م، ت، ی، مان، تان، یان) ئەركی گۆڕیوە بۆ (بكەر) لە ڕستەی ڕابردووی تێپەڕدا.

**سێیەم:** لە چارەكی سێیەمدا، هەمان میكانیزم خاڵی دوەم دەگوێزێتەوە و بەركاری كاری ڕانەبردووی تێپەڕ (م، ت، ی، مان، تان، یان) ئەركی دەگۆڕ بە (بكەر) لە ڕستەی

ڕابردووی تێپەڕدا. هەروەها، بەرکاری کاری ڕانەبردووی تێپەڕ یەکسان دەبێت بە بکەری کاری ڕابردووی تێپەڕ.

**چوارەم:** دەشێت چارەکی سێیەم فراوان بکرێتەوە بۆ هەر چوار جۆرەکەی ڕابردوو، چونکە بە گشتی (بکەری کاری تێنەپەڕ) دەبێت بە (بەرکار) لە کاری تێپەڕدا. واتە، ڕیزە جێناوی (م، یت، ـ ، ین، ن، ن) لە کاری تێپەڕدا وەك (بکەر) دەردەکەوێت، کەچی هەمان ڕیزە جێناوە لە کاری تێپەڕدا، وەك (بەرکار) دەر دەکەوێت.

**پێنجەم:** وەك لە خاڵی یەکەمدا باسکرا، لە چارەکی یەکەمدا، دیاردەی (ئێرگەتیڤایەتی) لە ئارادا نیە. و ڕیزە جێناوی ( م، یت، ێت، ین، ن، ن) لە کاری (تێنەپەڕ) و لە کاری (تێپەڕ)دا لە ڕۆڵی (بکەر)دا دەرکەوتوە. بە واتایەکی تر، دیاردەی (ئێرگەتیڤایەتی) لە دەمکاتی ڕانەبردوودا برەوی نیە.

لەبەر ڕووناکی خاڵەکانی پێشەوە، لە زمانی کوردیدا دیاردەی نیمچە ئەرکسالای (Split Ergativity) لە ئارادایە. ئەوەش لە یاد نەکەین کە ئەم دیاردەیە زۆر بەربلاوە، بە تایبەتی لە ئاستی (دەمکات)دا، چونکە دەمکاتی ڕابردوو سیستمی زمانەکە دەگۆڕێت. کەواتە، دیاردەی ئەرکسالاری بە شێوەی (لەتکراو) ڕووی داوە. لە ئەو لەتەدا، کە بریتیە لە (دەمکاتی ڕانەبردوو)ی گشت کارەکان بێجگە لە (بوون و هەبوون)، ئەو دیاردەیە لە ئارادا نیە. پاشان، لە ڕانەبردووی کاری (بوون و هەبوون)دا لە دایك بوە و ئەمجار بە هەر چوار لەتەکەی تردا، کە بریتیە لە چوار جۆر لە (ڕابردوو)، بە گشتی بلاوبوەتەوە. بە کورتی و بە کوردی ڕووبەری سیستمی (ئێرگەیتیڤ) چەند جارێك لە ڕووبەری سیستمی (ئەکیووزەیتیڤ) فراوانتر و بەرینترە، هەر لەبەر ئەوە، لە زمانی کوردیدا سیستمی ئەرکسالاری (ئێرگەیتیڤ) زۆر زاڵترە. بە داخەوە و بە حەیفەوە، ڕێزمانی تۆمارکراوی زمانی کوردی، لە دەمکاتی ڕابردوودا، بە لادا چەواشە بوە و بە سیستمی گشتی

ئەكیووزەیتیڤەوە خەریكە, كەچی نیوەی ڕاستی ڕێزمانەكەمان بە ڕاستەوخۆیی لە جۆری تایبەتی ئیرگەیتیڤە.

| A | S= O | | S | O | S = A | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕانەپردووی ئێستایی<br>Ergative<br>S = O ≠ A<br>(بەرکارسالاری) | | | | ڕانەبردووی ئاسایی<br>Accusative<br>S= A ≠ O<br>(بکەرسالاری) | | |
| تێپەڕ | | | تێنەپەڕ | تێنەپەڕ و تێپەڕ | | |
| A | S= O | | S | O | S = A | |
| م<br>ت<br>ی<br>مان<br>تان<br>یان | م<br>یت<br>(-)<br>ین<br>ن<br>ن | ئەرگگۆڕی Ergativity | م<br>یت<br>(-)<br>ین<br>ن<br>ن | م<br>ت<br>ی<br>مان<br>تان<br>یان | م<br>یت<br>ێت<br>ین<br>ن<br>ن | ڕانەبردوو |
| میکانیزمی ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردوو | | | | | | |
| م<br>ت<br>ی<br>مان<br>تان<br>یان | م<br>یت<br>(ە)<br>ین<br>ن<br>ن | ئەرگگۆڕی Ergativity | م<br>یت<br>(ە)<br>ین<br>ن<br>ن | (بەرکارسالاری)<br>ڕابردوو بە گشتی<br>Ergative<br>S = O ≠ A | | ڕابردوو |

نەخشەی (٥/٤): دابەشكردنی بكەرسالاری و بەركارسالاری لە زمانی كوردیدا.

بۆزانین: بكەری تێنەپەڕ -(S), بكەری تێپەڕ- (A), بەركار - (O)

## ٨/٤: نموونەیەك لە شیتەڵكاریدا

لە نموونەیەكدا، وەك:

**(ئێمە) ئێوەمان دەنووسی : (ـــــ) ئێوەمان دەنووسی**

دەتوانین، هەر چوار خەسڵەتەكە لێك بدەینەوە، وەك:

**یەكەم:** لـە ئـەو نموونەیـەدا، ڕیزبەنـدی [بكـەر (ئێمـە)، بـەركار (ئێـوە)، كـار (دەمـان نووسی)] لە ئارادایە. واتە هێمای (SOV) چەسپاوە.

**دووەم:** سـەبارەت بـە خەسـڵەتی (پـرۆدرۆپ) دەشـێت بكـەری (ئێمـە) بسـڕینەوە، وەك: (ئێوەمان دەنووسی).

**سێیەم:** سەبارەت بە زمانی نووسەكی (Agglutinative Language)، دەتوانین مۆرفیمەكان بە خنجی لە یەكتری جودا بكەینەوە و هیچ مۆرفیمێك نیە كە ئەو دیاردەیە پەسەند نەكات، وەك: **(ئێمە ـ ئێوە ـ مان ـ دە ـ ناس ـ ی)، یان وەك خانەچنكراوە لە پلیكانەی ڕستەدا:**

| ئێمە | ئێوە | مان | دە | ناس | ی | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| +٦ | +٥ | -٦ | +٢ | سفر | -٢ | -٦ |

**چوارەم:** بۆ ئەوەی تێ بگەین لە ئەو ڕاستیەی كە زمانەكەمان لە جۆری ئێرگەیتیڤـە، دەتوانین بكەری (ئێوە) بكەین بە جێناوی لكاو، وەك:

**ئێمە دەمان ناسیـ([redacted])**

ئێستا ئەگەر بەركاری (ئێوە) بخەینە سەر كارێكی تێنەپەڕ، وەك (خەوتن)، وەك:

**ئێوە دەخەوتـ([redacted])**

دەبینین کە جێناوی ([redacted]) لە ڕستە تێپەڕەکەدا (بەرکار)ە و لە ڕستە تێنەپەڕەکەدا (بکەر)ە. یان، دەتوانین جێناوی (بکەر) لە رستەی (ئێمە دە[redacted] ناسین)دا، بکەین بە جێناوی (بەرکار) لە رستەیەکی رانەبردوودا وەك (ئەوان دە[redacted] ناسن). کەواتە، دیاردەی ئەرکسالاری (Ergativity) لە ئارادایە، چونکە جێناوەکان (ئەرکگۆڕکێ) دەکەن.

کەواتە، هەر چوار خەسڵەتەکە ماکی خۆیان پیشاندا بە ڕستەیکی زمانی کوردیەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، مەرج نیە هەر خەسڵەتێك بە تەواوەتی بچەسپێت، بەڵام دەشێت بە سەر زۆربەی زمانەکەدا بچەسپێت.

## ٩/٤: پوختەی خەسڵەتەکانی زمانی کوردی

بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لە پێشەوە باسکران، دەتوانین خەسڵەتەکانی زمانی کوردی دیاری بکەین، بە ئەم چەشنە:

**خەسڵەتی یەکەم:** لە بیردۆزی ریزبەندی وشەدا (Word Order)، زمانی کوردی لە تەرزی سۆڤە (SOV). واتە، ریزبەندی کۆڵکە سەرەکیەکانی ڕستە بە ئەم چەشنەیە:

[بکەر : بەرکار : کار]: SOV

**خەسڵەتی دووەم:** زمانەکەمان لە تەرزی بکەر بەزێنە (Pro-drop). واتە، لە بەزاندنی (بکەر)دا زمانی مرۆڤ دابەش دەبێت بۆ (بکەربەزێن) و (بکەرپارێز). بە واتایەکی تر زمانی کوردی لە ئەو تەرزەیە کە دەتوانێت بکەری جودا لابدات، چونکە (بکەر) نیشانەی خۆی هەیە لەسەر کار، کە بە (بکەری لکاو) ناسراوە. کەواتە دەتوانین بە زمانەکەمان بڵێین (Pro-drop Language) لە ئەم جۆرە زمانەدا، ژمارەی رستەکان

دەبێت بە (دووبارە)، چونكە هەر ڕستەیەك دووباری هەیە، وەك باری (بكەر پارێزی) و باری (بكەر بەزێنی).

**خەسڵەتی سێیەم:** بەپێی بیردۆزی دابەشبوونی مۆرفیم لە بنیادی وشەدا، زمانی كوردی لە تەرزی (نووسەكی)یە. واتە، مۆرفیمەكانی وشەی زمانی كوردی یەك یەك ریز دەبن بەدوای یەكدا و پێكەوە دەنووسێن و بنیادی (وشە) دروست دەكەن. لە ئەم ڕووەوە، زمانی بەندەی سەر زەوی دابەش كراوە بۆ سێ تەرز، وەك:

- زمانی دابڕاو (Isolating Language)
- زمانی نووسەكی (Agglutinative Language)
- زمانی تێك تواوە ( Fusional Language)

زمانەكەی ئێمەش لە تەرزی دوەمە، كە پێی دەگوترێت ( Agglutinative Language). ئەم جۆرە زمانە سیمای (خانەرێژی) هەڵ دەگرن و پلیكانەیەكی ئەندازیاریانە دەبەخشن بە بنیادی وشەكان.

**خەسڵەتی چوارەم:** سیستمی زمانەكان دابەش دەبێت بە سەر دوو جۆردا. جۆری یەكەم پێی دەگوترێت دۆخی (بكەرسالاری), بە واتای (Accusative case). جۆری دودم پێی دەگوترێت دۆخی (ئەركسالاری), بە واتای (Ergative). لە ئەم دابەشبوونەدا، زمانی كوردی ڕوو دەكات لە جۆری (Ergative Language ).

بە شێوەیەكی گشتی، دەتوانین گشت خەسڵەتەكان لە نەخشەیەكدا كۆ بكەینەوە، تا لە سەر ئەو نەخشەیە خەسڵەتەكانی زمانی كوردی بە وردی دەربخەین، نەخشەی (٦/٤). لە پاشتردا، لەسەر نەخشەی (٧/٤)، دەتوانین دەستە خوشكەكانی زمانی كوردی دەربخەین، بۆ

ئـەوەی بـە بـەراوردێكی سـفت و سـۆڵ ڕیزبەندەكـەی بدۆزینـەوە لـە نێـو زمانـە سروشتیەكاندا.

| خەسڵەتەكان | تەرزەكان | نموونە |
|---|---|---|
| خەسڵەتی یەكەم | SOV | زمانی كوردی |
| | SVO | - |
| | VSO | - |
| | VOS | - |
| | OVS | - |
| | OSV | - |
| خەسڵەتی دوەم | Pro-drop | زمانی كوردی |
| | None | - |
| خەسڵەتی سێیەم | Isolatiug | - |
| | agglutiuative | زمانی كوردی |
| | Fusional | - |
| خەسڵەتی چوارەم | nominative-accusative | - |
| | ergative-absolutive | زمانی كوردی |

خشتەی (٦/٤): خەسڵەتەكانی زمانی كوردی (ڕووبەرە تاریككراوەكان)

| خەسڵەتەكان | دەستە خوشكەكانی زمانی كوردی<br>زمانە هاوتەرزەكان |
|---|---|
| SOV-language<br>ڕیزبەندی<br>(بكەر - بەركار - كار) | باسكی، توركی، یابانی، فارسی،... |
| Pro-drop language<br>دیاردەی<br>(بكەر بەزێنی) | ئیتالی، ئیسپانی، لاتینی،.... |
| Agglutinative language<br>زمانی نووسەكی | یابانی، توركی، سەواحیلی، هەنگاری، فینی، زمانگەلی بـانتۆ لـە ئەفریكا،هەنـدێك لـە زمانگەلی ئەمەریكا و ئوستەرالیا، زۆربـەی زمانەكانی ڕووسیا |
| Ergative-absolutive language<br>دۆخی (ئەركگری - ڕەهایی) یان،<br>دۆخی (ئەركگری) | باسـكی، زمانگـەلی ئەمـەریكا لـە چەشـنی ئەسـكیمۆ، هەنـدێك زمـانی ئـەفریكی، هەندێك زمانی ئاسیایی، وەك (تەبتی) |

خشتەی (٧/٤): دەستە خوشكەكانی زمانی كوردی بەپێی خەسڵەتەكان

## ٤/١٠: جووت بوونی دوو خەسڵەت:

لە زمانی كوردیدا، دوو خەسڵەت تێكهەڵكێش دەبن. یەكەمیان بریتیـە لـە ڕیزبەنـدی سۆڤ (SOV) و دووەمیان بریتیـە لە دیاردەی بكـەر بـەزێنی (Pro-drop) لـە ڕستـەیەكدا وەك: (**شـیلان چـل دەشـۆرێت**)، ڕیزبەنـدی (SOV) لـە ئارادایـە، بـەڵام لـە ئـەو ڕستـەیەدا دەشێت بكەری (شیلان) لاببەین، چونكە زمانەكەمان لـە جـۆری بكەربەزێنـە، وەك: (**ـــــ چـل دەشـۆرێت**). لـە نموونەیـەكی ئاوهـادا، هێماكـە دەبێـت بـە (OV-)، بـەڵام نوێنـەری

بكەرەكە هەر ماوە لە ریزەكەدا، كە بریتیە لە نیشانەی (ێت)، كە وەك (جێناوێكی لكاو) پەیوەست بوە بە كارەكەوە. هەر لەبەر ئەوە، دەشێت هێمای (S)ی بچووك بار بكەین لە ریزەكە، وەك (OVs....)، یان دەتوانین هەردوو هێماكەی (بكەر) دابنێین، وەك (SOVs).

هەر بۆ نموونە، دەشێت ڕستەی (شیلان جل دەشۆرێت) بە هێمای (SOVs) نیشانە بكرێت و ڕستەی (ـــ جل دەشۆرێت) بە هێمای (-OVs) نیشانە بكرێت. بێگومان، هێمای (S)ی بچووك هێندە رۆڵەكەی گرنگە و رەهایە و نەگۆڕە، دەبێت فەرامۆش نەكرێت، چونكە بەهۆی ئەو جێناوەوە، توانراوە كە (بكەری جودا) لابردرێت. بەواتایەكی تر، هێمای (S)ی بچووك بەرانبەر بە جێناوی لكاو (ێت) دەوەستێت، كە نابێت لابچێت و هێمای (S)ی گەورە بەرانبەر بە ناوی (شیلان) دەوەستێت، كە دەشێت لابچێت. كەواتە، وەك (S)ی بچووك، بریتیە لە بەردی بناغەی ڕستە، دەشێت بەرجەستە بكرێت لە ریزبەندەكەدا، چونكە رۆڵی ئەو گرنگترە لە رۆڵی (S)ی گەورە.

### ١١/٤: زمانی كوردی و هەندێك خەسڵەتی تر:

لە زمانی كوردیدا، هەندێك خەسڵەتی تر هەیە كە پێ دەچێت لە زمانەوانیدا باس نەكرابێت, یان ئەگەر باسكرابێت، هەر ناوزەد كرابێت، وەك:

**یەكەم:** خەسڵەتی (جێگۆڕكێی جێناوی لكاو). لە ئاستی ئەم دیاردەیەدا، سێتە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) وزەیەكی گەورە هەڵ دەگرن بۆ جێگۆڕكێ بە (بازبازێن) بە سەر پلەكانی پلیكانەی ڕستەدا و لەسەر یەكەم پلەی پلیكانەكە ڕادەوەستن ، وەك لە سەر نەخشەی (٨/٤) نەخشەرێژكراوە. لە ئەم ریزە نموونەیەدا، جێناوی (مان) پێنج بازی داوە و لە هەر ڕستەیەكدا، لەسەر یەكەم كۆلكەی بەرایی گیرساوەتەوە. بە ڕاستی، ئەم خەسڵەتەی زمانی كوردی (كرمانجی خواروو) زۆر زۆر دەگمەن و كرۆكیە و ماكی

مۆرکایەتی هەڵ دەگرێت[١٤]. سەرەڕای ئەوەی میکانیزمی (جێگۆڕکێی جێناوی لکاو) بنەمایەکی زانستی باڵکێش و پتەوی هەیە لە ژێرخانی زمانەکەدا.




نەخشەی (٨/٤): میکانیزمی جێگۆڕکێ جێناوی لکاو (م، ت، ی، مان، تان، یان)، جێناوی (مان) بە نموونە.

دووەم: لە سیستمی (ئێرگەیتیڤ)دا، دۆخی (بکەر) لە کاری تێنەپەڕدا، یەکسان دەبێت بە دۆخی (بەرکار) لە کاری تێپەڕدا، ئەم دیاردەیە لە زمانی کوردیدا یەکلۆ نیە، بەڵکو بە (دوولۆیی) دەچەسپێت. لۆی یەکەمی ئەم سیستمە بە تەواوی لە سەر سێتە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) دەچەسپێت، چونکە جارێك بە ساغی (بەرکار)ە و جارێك بە ساغی (بکەر)ە. وەلێ، لۆی دووەمی ئەم سیستمە بە لەنگی دەچەسپێت بە سەر سێتە جێناوی (م، یت، ێت، ین، ن، ن)دا، چونکە:

(١): ڕوخساری جێناوی کەسی سێیەمی تاك دەبێت بە نادیار (ــ) لە سیستمی ئێرگەیتیڤدا، وەك: (م، یت، ــ، ین، ن، ن).

[١٤] بۆ زانیاری تەواو لە سەر بابەتی جێگۆڕکێی جێناو، بڕوانە کتێبی (سێ میکانیزمی ڕێزمانی/ هەولێر ٢٠١٢ ).

(٢): هەمان سێتە جێناو (م, یت, ـــ, ین, ن, ن) دوو ئەرك دەگێڕێت لە دەمكاتی ڕابردوودا (سیستمی ئێرگەیتیڤ), وەك: (بكەری كاری تێنەپەڕ) و (بەركاری كاری تێپەڕ).

بە پوختی, لە زمانی كوردیدا (كرمانجی خواروو), سێتە جێناوی (م, ت, ی, مان, تان, یان) دەبێت بە (تەوەر) لە شیكاری سیستمی ئێرگەیتیڤدا. بۆ نموونە، لە نێوان دەمكاتی ڕانەبردوو و دەمكاتی ڕابردوودا، جێناوی (بەركاری ڕانەبردوو)ی ئەم سێتە جێناوە بە تەواوی دەبێت بە جێناوی (بكەری ڕابردوو). وەك ئەنجامێك بۆ ئەم ئەركگۆڕكێیە, جێناوی (بكەری ڕانەبردوو) دەبێت بە جێناوی (بەركاری ڕابردوو). لە هەمان كاتدا، ئەم دیاردەیە خۆی لە خۆیدا بریتیە لە (میكانیزمی وەرچەرخان لە ئەركی جێناودا)، وەك لە سەر نەخشەی (٩/٤) ڕوونكراوەتەوە. بە سەرنجێكی ورد لە ئەو نەخشەیە, دەبینین كە:

(١): جێناوی (تان), لە سیستمی ئەكیووزەیتیڤدا, ئەركی بنەڕەتی (بەركار)ی گۆڕیوە بە ئەركی لاوەكی (بكەر) لە سیستمی ئێرگەیتیڤدا.

(٢): جێناوی (ین), لە سیستمی ئەكیووزەیتیڤدا, ئەركی بنەڕەتی (بكەر)ی گۆڕیوە بە ئەركی لاوەكی (بەركار) لە سیستمی ئێرگەیتیڤدا.

ئەم دیاردەیە مامۆستا مەسعوود محەمەد (١٩٧٦) و د. وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) هەستیان پێ كردوە, بەلاَم نەیان بەستوە بە سیستمی ئێرگەیتیڤەوە.




• نەخشەی (٩/٤): میكانیزمی وەرچەرخان لە ئەركی جێناوی لكاودا.

سێیەم: بە شێوازێكی زۆر سەیر و زۆر ناوازە بە ئەو زمانانانەی كە ئێمە لێیان ئاشناین، میچەكانی سێتە جێناوی جودا (من، تۆ، ئەو، ئێمە ئێوە، ئەوان) دەتوانن، بە ئاڵ و گۆڕەوە، هەر سێ ئەركی ڕێزمانی (بكەر، بەركار، بەركاری ناڕاستەخۆ) بگێڕن لە هەمان ڕستەدا، وەك:

| دەمكاتی ڕابردوو | دەمكاتی ڕانەبردوو |
|---|---|
| (من) (ئەو)م دا بە (تۆ) | (من) (ئەو) دەدەم بە (تۆ) |
| (من) (تۆ)م دا بە (ئەو) | (من) (تۆ) دەدەم بە (ئەو) |
| (تۆ) (ئەو)ت دا بە (من) | (تۆ) (ئەو) دەدەیت بە (من) |
| (تۆ) (من)ت دا بە (ئەو) | (تۆ) (من) دەدەیت بە (ئەو) |
| (ئەو) (من)ی دا بە (تۆ) | (ئەو) (من) دەدات بە (تۆ) |
| (ئەو) (تۆ)ی دا بە (من) | (ئەو) (تۆ) دەدات بە (من) |

تەنانەت لە كەسی سێیەمدا، دەشێت لە ڕێزمان دەرنەچین و بگوین: {(ئەو)(ئەو) دەدات بە (ئەو)}، یان، (ئەو)(ئەم) دەدات بە (ئەو)، یان (ئەم) (ئەو) دەدات بە (ئەو). یان (ئەوان)(ئەمان) دەدات بە (ئەوان)، یان هەر تێكهەڵكێشێكی تر لە نێوان بارەكانی (تاك و كۆ) و (دوور و نزیك)ی جێناوە جوداكاندا، وەك: (ئەو، ئەوان، ئەم، ئەمان). بە ڕاستی، ئەم خەسڵەتە زۆر شاز و دەگمەنە، چونكە، بە لانی كەمەوە، ناتوانین ئەو ئاڵ و گۆڕانەی پێشەوە بەدی بهێنین لە زمانی عەرەبی و ئنگلیزی و فەرەنسیدا. كەواتە، ئەگەر بە شێوازێكی تووناوتوون و بلیمەتانە لە ئەم خەسڵەتە ورد ببینەوە، تێ دەگەین كە سیستمی ئەركسالاری جێناوەكان (ئیرگەیتیڤ) بێ دوورە، بەڵام بنەمادارە و ڕەگ و ڕەگێشەی ورد و نەبینراوی هەیە لە ئەو پرۆگرامەدا كە زمانەكەی پێ دەگەڕێت.

**چوارەم**: لـە زمـانی كوردیـدا، جێنزرگـە و یەكـەم زێـدی لـە دایكبـوونی خەسـڵەتی (ئیرگەتیڤ) بە جوانی و بە وردی و بە سفتی دیاریكراوە. واتە، خـاڵی وەرچـەرخان بـەرەو (ئیرگەتیڤ) دیاری كراوە بە دەمكاتی (ڕانەبردوو) لە هـەردوو كـاری (بـوون و هـەبوون)دا. لەسـەر نەخشـەی (٢/٤)، بـە ئاشـكرا دیـارە كـە لـە چـارەكی دووەمـەوە دەسـتی پێكـردوە. ئەمەیش بروسكەیەكی زانستی دەنێرێت بۆ زمانەوانی گشتی كە لە زمانی كوردیدا (زێـدی یەكـەم)ی سیسـتمی (ئیرگـەیتیڤ) لـە ڕانـەبردووی كـاری بـوونی ئێسـتاییدایە, چـونكە سیستمی (ئیرگـەیتیڤ), ئەگـەر هـەبێت لـە زمانێكـدا, لـە ئێـرەوە دەسـت پـێ دەكـات. ئـەم بنەمایە ڕەنگە كەڵكی كاریگەری هەبێت لە شیكردنەوەی ئەم سیستمەدا.

**پێنجەم**: سێتە جێناوی (م، یت، ێت، ین، ن، ن) لە (دەمكاتی ڕانـەبردوو)دا دەبێـت بـە بكەرێكی (هاوبەش)، چی بۆ كاری (تێنەپەڕ) و چـی بـۆ كـاری (تێپـەڕ), چـونكە سیسـتمی نەكیووزەیتیڤ دادەمەزێت. لە بەرانبەردا، لە باری (ئیرگەتیڤ)دا، هەمان سێتە جێنـاو, لـە پاش بە نادیاركردنی جێناوی كەسی سێیەمی تاك, دەبێت بـە (بكـەر) لـە كـاری ڕابـردووی (تێنەپەڕ)دا و دەبێت بە (بەركار) لە كاری ڕابردووی (تێپـەڕ)دا. هـەر لـە بـەر ئـەو هۆیـە، هـەر لـە سـەرەتای نووسـینەكانەوە، ئێمـە خەسـڵەتی ئـەم سـێتە جێناوەمـان بـە ڕژدی ڕەچـاوكردوە و بـە (پـۆلی یەكـەم) ناوزەدمـان كـردوە، چـونكە لـە ئەركـە گرنگەكـەی تێكەیشتبووین لە سیستمی نەكیووزەیتیڤدا, بە ڕێسای (S=A≠O). لـە بەرانبـەردا، گشـت ڕێزماننووسانی تر ئەم پۆلە بە (پۆلی دووەم) ناو دەبەن, بەڵام پۆلـە نەگۆڕەكـە (م، ت، ی، مان، تان، یان) بە پۆلی یەكەم ناو دەبەن. ئەو پۆلە جێناوەی, بەبێ هیچ دەستكاریەك, لـە كاری (تێپەڕ)دا, لە ڕانەبردوودا (بەركار)ە, كەچی بە گۆڕینی دەمكات (بۆ ڕابـردوو) ئـەرك دەگۆڕێت بۆ (بكەر). ئەمەیش ڕەنگە بە (خەسڵەت) نەڕوات, بەڵام پـەیامێك دەنێرێـت بـۆ گرنگی ڕیزبەندی هەردوو جێناوەكە, چی لە زمانی كوردیدا و چی لە زمانانی تردا.

شەشەم: لە زمانی کوردیدا, خەسڵەتی (دوور و نزیك) لە ڕێزمانی (جێناوی کەسی سێیەم)ەوە دەست پێ دەکات, ئەوەك بە شێوەی زمانانی تر لە (ئامرازی ئاماژە)ەوە, وەك (ئەو, ئەوان) بۆ باری دوور و (ئەم و ئەمان) بۆ باری نزیکتر. ئەو ڕێزماننووسەی کە باوەڕ ناکات, با بزانێت, وەك چۆن چوار (جێناو)ی ساغ هەیە, وەك: (ئەو, ئەوان و ئەم, ئەمان), هەر ئاوهایش چوار ئامرازی ئاماژە هەیە, وەك: (ئەوە, ئەوانە و ئەمە, ئەمانە). لە هەمان کاتدا, چوار ئامرازی گەیەنەر هەیە, وەك: (ئەوەی کە هات, ئەوانەی کە هاتن و ئەمەی کە هات, ئەمانەی کە هاتن)[15]. سەرەڕای ئەو خەسڵەتە, بڕوانە: چۆن ئەو چوار جێناوەی کەسی سێیەم (تاریککراوەکان), بە زەبری مۆرفیمی ئاماژە (ـە), کراون بە (بنکە) بۆ ڕۆنانی چوار ئامرازی ئاماژە, یان چۆن ئەو چوار ئامرازەی ئاماژە (تاریککراوەکان), بە زەبری مۆرفیمی کەرەستەی گەیاندن (ی + کە + کار), کراون بە (بنکە) بۆ ڕۆنانی چوار (ئامرازی گەیەنەر). ئایا لە چی زمانێکدا, ئەو خزمایەتیە (ڕۆنانی)یەی جێناوی کەسی سێیەم وا ڕوون و زەلاڵ دیارە بەو سێ بابەتە ڕێزمانیەوە. ئەم ڕاستیەیش ڕێنیشاندەرێکی کاریگەرە بۆ شیکاری ئەو خزمایەتیە نارووونەی نێوان کەرەستەکانی (هو, هذا, الذي) لە عەرەبیدا, یان کەرەستەکانی (he, this, who) لە ئنگلیزیدا.

[15] بۆ زنیاری زۆر کاریگەرتر لە سەر ئەم بابەتە وردە, بڕوانە بۆ بابەتەکانی (٢, ٤, ٥, ٦) لە کتێبی (گەشتێك بە نێو ئامرازەکانی ناساندندا), هەولێر ٢٠١٦. یان بابەتەکانی (٧, ٨, ٩) لە کتێبی (زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوددا), هەولێر ٢٠١٥.

### ٤/١٢: پوختەكاری

- لەڕووی ڕیزبەندی (كار) و (بكەر) و (بەركار)ەوە، زمانی كوردی ڕیزبەندی (SOV)ی هەیە. ئەم ڕیزبەندە بەربڵاوترین جۆری زمانە.
- بەشێوەیەكی گشتی، ئەو دوو جۆرەی كە بە بكەر (S) دەست پێدەكەن، كە بریتین لە (SOV) و (SVO)، زۆرترن لە ئەوانەی كە بە كار (V) دەست پێدەكەن. بە واتایەكی تر، ئەو دوو جۆرەی كە (بكەر ـ لەپێش)ن زۆر بە مەوداتر و بەربڵاوترن لە ئەو دوو جۆرەی كە لە جۆری (كار ـ لەپێش)ن.
- لە ڕووی (بكەر بەزاندن)ەوە، زمانانی بەندەی سەرزەوی دابەش دەبن بە سەر دوو جۆردا، جۆری یەكەم بریتیە لە (زمانی بكەربەزێن) و جۆری دوەم بریتیە لە (زمانی بكەر پارێز). زمانەكەی ئێمەیش لە جۆری (بكەربەزێن)ە. ئەم خەسڵەتە وا دەكات كە هەر ڕستەیەكی زمانی كوردی دوو دیوی هەبێت، وەك:

ـ دیوی (بكەر پارێزی)، وەك: (من دەڕۆم)

ـ دیوی (بكەر بەزێنی)، وەك: (ــ دەڕۆم)

كەواتە، بەرانبەر بە هەر زمانێكی (بكەرپارێز)، وەك ئینگلیزی، زمانی كوردی دوو باری هەیە بۆ ڕستەی (I go) و بۆ هەر ڕستەیەكی تر. ئەم دیاردەیە وا دەكات كە هەر ڕستەیەك ببێت بە (دوودیو).

- لەبەر ئەوەی لە ڕستەی زمانی كوردیدا، كۆڵكەی (بكەر) دوو دیوی هەیە، واتە كۆڵكەی (بكەر) نیشانەیەكی خۆی دادەنێت لەسەر كار بە (جێناوی لكاو)، دەشێت هێمای (SOV) هەموار بكەین. بۆ نموونە، دەشێت هێمای (s)ێكی بچووك بخەینە پاش هێمای كار (V) و بە هێمای (SOVs) تۆماری بكەین.
- كاتێك كە خەسڵەتی سۆڤ (SOV) و خەسڵەتی بكەر بەزاندن (Pro-drop) یەكتری دەگرن، دەشێت هێماكە بە ئەم جەشنە تۆمار بكەین:

- بۆ (بكەر پارێزی) هێمای (SOVs)
- بۆ (بكەر بەزێنی) هێمای (-OVs)

- لە ڕووی بنیادی مۆرفۆلۆژیەوە، زمانانی بەندەی سەر زەوی دابەشكراون بۆ سێ خێزانی سەرەكی و زمانەكەی ئێمەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆری دووەم كە بریتیە لە زمانە نووسەكیەكان (Agglutinative Languages). ئەم جۆرە زمانە، زۆر بە وردی و بە جوانی مۆرفیمەكان ریز دەكات و دەشێت هەر مۆرفیمێك ریزبەند و جێگای ئەندازیارانەی خۆی هەبێت و بە ئاسانیش جودا بكرێتەوە لە مۆرفیمەكانی دراوسێی.
- لە ڕووی (ڕێزمانی دۆخ)ەوە، واتە لە ڕووی دۆخی (بكەر) و دۆخی (بەركار) لە بنیادی كاردا، زمانەكان دابەش كراون بۆ دوو خێزان، وەك:

<u>خێزانی یەكەم</u>: ئەو زمانانەی كە جێناوی (بەركار)یان نیشانە كراوە، وەك جێناوی (him) بەرانبەر بە كەسی سێیەمی تاك (He). ئەم جۆرە زمانە بە (-Nominative Accusative Languages) ناسراوە، واتە زمانی (بكەر - بەركاری). زمانەكەی ئێمەیش، لە دەمكاتی (ڕانەبردوو)دا، سەر بە ئەم تەرزە زمانەیە.

<u>خێزانی دووەم</u>: ئەو زمانانەی كە لە جیاتی ئەوەی (بەركار) نیشانە بكەن، بكەری (كاری تێنەپەڕ) دەكەن بە (بەركار) بۆ (كاری تێپەڕ). ئەم جۆرە زمانە بە (-Ergative absolutive) ناسراوە، زمانەكەی ئێمەیش، لە دەمكاتی (ڕابردوو)دا، سەر بە ئەم تەرزە زمانەیە.

- دەشێت بڵێین: [زمانی كوردی بریتیە لە تەرزە زمانێكی سۆڤ (SOV)، بكەر بەزێن، نووسەكی و ئەركسالار].
- زمانی كوردی پەیامی هەندێك خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەڵ دەگرێت، كە ڕەنگە زۆر دەگمەن و دانسقە بێت لە زمانانی تردا، وەك (جێگۆڕكێی جێناو لكاو، میكانیزمی وەرچەرخان لە ئەركی جێناودا، ...).

**سەرچاوە:**

بەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ کـەڵك وەرگـیراوە لـە ئـەم سەرچـاوانەی خـوارەوە، بـۆ پۆلێنکردنی زمانەکان و دۆزینەوەی نزرگەی زمانی کوردی لەم دابەشکردنەدا:

- د. شێرکۆ بابان، ئیشە بلاّوکراوەکانی خۆمان لەسەر ڕێزمانی کوردی.

- د. وریا عومەر ئەمین، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، هـەولێر ٢٠٠٤، ل(٢٢-٢٣، ٦٩، ٨٩، ٢٣٦-٢٣٧، ٢٧٢، ٢٨٠، ٢٨٦-٢٩٦).

- د. تالیب حوسێن عەلی، ریزبوونی کەرەستەکانی ڕستەی سادە لە زمـانی کوردیـدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە(٤٢)، هەولێر ٢٠٠٢.

- د. وریـا عومـەر ئـەمین, سیسـتمی کـارکردنی رانـاو لـە کـوردی ژووروودا, گۆڤـاری (ڕەنگین), ژمارە (١٤٧), بەغدا ٢٠٠١.

- د. نەسرین فەخری, کورتەی نامەی دکتۆراکەم و هۆی هەڵ بژاردنی ئەم بەشـە, کـە دەربـارەی رانـاوی کەسـیە جـودا و لکاوەکانـە, لـە هـەردوو شـێوەی خـواروو و ژووروودا, گۆڤاری (ڕەنگین), ژمارە (١٤٧), بەغدا ٢٠٠١.

- مـزگین عەبـدولڕەحمان ئەحمـەد، دۆخـی ئێرگـەتیف لـە زمـانی کوردیـدا، کرمـانجی سەروو، نامەی مەستەر، کۆلیژی پەروەردە، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠٠٦.

- د. محەمەد مەعرووف فەتتاح, لێکۆڵینەوە زمانەوانیەکان, هەولێر ٢٠١٠.

- د. وریا عومەر ئەمین, لە پیتۆکەکانی زمانەوانی, چاپی یەکەم, هەولێر ٢٠١١.

- د. عەبدولواحید موشیر دزەیی, ڕێزمانی کوردی, چاپی یەکەم, هەولێر ٢٠١٤.

- F. Katamba, Morphology, Macmillon Press, England 1993.

- J. Aitchison, Linguistics, Britich Library, London 1992

- A. Radford et al., Linguistics an Introduction, Cambridge University Press, UK1999.

- R. Trask, A Dictionary of Grammatical Terms in Linguistics, Routledge, London 1993.

- M. Tallerman, Understanding Syntax, 3rd edition, Hodder Education, 2011.

- M. Haspelmath & A. Sims, Understanding MorPhology, 2nd edition, Hodder Education, 2012.

# بابەتی پێنجەم

# هەندێك تایبەتمەندی دەنگسازیانە لە نیشانەكانی رابردوو (د) و (ت)دا[16].

## ١/٥- دەستپێك:

لە رێزمانی كوردیدا، هەندێك كێشە هەیە كە بنەمادارە و ناشێت و نابێت هەر وا بە سەرپێی بە سەریاندا برۆین. بۆ نموونە، هەندێك كار هەیە كە بە (نارێك) ناوبردراون, وەك (كردن، بردن، خستن، گەیشتن، نوستن، ...)، بەڵام نەزانراوە، بۆچی نارێكن، یان وەك زانراوە نارێكن, لە بنج و بنەواشەی ئەم نارێكیە هەڵوەستەیان نەكردوە. لە لایەكی ترەوە، هەندێك لە كارە نارێكەكان زۆر لێڵن و نازانرێت لە كام روخساردا (نارێك)ن و لە كام روخساردا (رێك)ن. لە نموونەیەكدا وەك كاری (كردن)، بنجی رانەبردوو بریتیە لە (كە) وەك (ئیش دەكەم) و رەگی رابردوو (قەد) بریتیە لە (كرد) وەك (ئیشم كرد). لە ئەم هەلوێستەدا، نازانرێت، ئایا روخساری بنجی (كە) نارێكە، یان قەدی (كرد). بێگومان، هەتا ئێستا ئەو بۆچوونە باوە كە بنجی (كە) نارێكە و دەبا بریتیبا لە (كر) و لە پاشتردا نیشانەی رابردووی /د/ی وەرگرتبا و ببووبا بە (كرد). ئەمە و لە ئاستی ئەم كێشەیەدا شرۆڤەكاری و شلكردنەوەی زۆر سفت و دانسقە پێویستن بۆ ئەوەی كێشەكە بە وەستایی یەكلایی بكرێتەوە. لە برگەكانی داهاتوودا, روودەكەین لە ئەو نارێشەیە و بە هیوای ئەوەی بتوانین نەختێك لە كرۆكی بابەتە نزیك ببینەوە.

---

[16] گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (٢٣٣)، ساڵی ٢٠٠٧، لاپەڕە (١٦٦-١٧٢).

## ٢/٥: نیشانەكانی رابردوو:

لە زمانی كوردیدا، یەكلایی بوەتەوە كە پێنج نیشانەی رابردوو هەیە, وەك (ا، د، ت، وو، ی) و بە ناوی ئەم دەنگانەوە چاوگەكانی زمانی كوردی ناوزەدكراون بە (چاوگی ئەلفی، چاوگی دالی، چاوگی تائی، چاوگی واوی، چاوگی یائی). لەگەڵ ئەو راستیەیشدا، ئەم دەنگانە دابەشبوونێكی دەنگسازیان هەیە, لە چەشنی ئەوەی كە لە سەر نەخشەی (١/٥) تۆماركراون. ئەم پێنج نیشانەیە زۆر بە زبری و زۆر بە تورتی دەچنە سەر بنجی كار و هەندێك ئاكاری سەیر و سەمەرە بەرپا دەكەن، كە دەبێت بە هۆی تێكچوونی روخساری رەگی رابردوو، نەخشەی (٢/٥). بێگومان، ئەو دوو كێشەیەی كە نیشانەكانی رابردوو /د/ و /ت/، یان/وو/ و/ی/ بەرپای دەكەن، خۆیان لە خۆیاندا دەشێت بریتیبن لە (مانگرتنی رێزمانی). ئەگەرنا، بۆچی دەنگی/د/ و /ت/ لە یاساكانی دەنگسازی بەلەسە دەبن، یان بۆچی نیمچەبزوێنی /وو/ و/ی/ نەفرین دەكەن لە رەسەنی خۆیان و میكانیزمی (نیمچەبزوێنایەتی) رەت دەكەنەوە. بێگومان، ئەو مانگرتنە دەنگسازیە وا دەكات كە ریزبەندی دەنگەكان تێك بچێت و هەندێك جێگا بە كلۆری بمێنێتەوە و كێشە بۆ كۆئەندامی (ئاخاوتن) بنێنەوە. لە ئەم سەروبەندەدا، دەشێت ئەو كلۆریانە بە هەندێك دەنگ پڕ بكرێتەوە (بە بزار), نەك بە شێوەیەكی هەڕەمەكی، چونكە هەر كلۆرییەك دەبێت بە فەوارەی خۆی پڕ بكرێتەوە. هەر لەبەر ئەوە، كۆئەندامی (ئاخاوتن) پەنا دەبا بۆ ئەو دەنگانەی كە بتوانن ئەو كلۆریە مشتوماڵ بكەن و نەهێڵن (رژێمی دەنگسازی) لەكەدار بێت و زاری مرۆڤ كورت بهێنێت لە گۆكردندا.

| دەنگ | دابەشبوون |
|---|---|
| ا | دەنگی بزوێن |
| د<br>ت | دەنگی نەبزوێن |
| وو<br>ی | دەنگی نیمچە بزوێن |

نەخشەی (١/٥): دابەشبوونی دەنگسازی بۆ نیشانەكانی رابردوو

| نیشانەی رابردوو | كێشە و چەڵمە |
|---|---|
| نیشانەی /ا/ وەك: سووتـا، ژاكــا | ئـەم دەنگـە كێشـەی نیـە و هـیچ گۆرانكاریـەكی ئـەوتۆ ناسەپێنێت بەسەر بنجی كاردا. |
| نیشانەی/د/ و /ت/, وەك: مرد، كرد، گەیشـت، نووسـت | ئـەم دوو دەنگـە كێشـەدارن و بنجـی كـار دەخەنـە بـەر مەحەكی فۆنۆلۆژی، چـونكە بـزوێنی بزرۆكـە پەسـەند ناكـەن، حـەز دەكـەن بـبن بـە دەنگـی دوەم لـە پـاش (بزوێن). |
| نیشانەی (وو) و(ی)، وەك: چـوو، بـوو، وەری، كری | ئــەم دوو دەنگــە وەك (نیمچــە بــزوێن)ن، بــەڵام قفـل دراون بە دیوی (بزوێن)دا و باری (نـەبزوێن) پەسـەند ناكەن. |

نەخشەی (٢:٥): كێشەكانی نیشانەكانی رابردوو.

## ٣/٥: نیشانەكانی ڕابردوو/د/ و /ت/:

كێشەی نیشانەكانی ڕابردوو/د/ و /ت/ لە ئەو ڕاستیەوە سەرچاوەی گرتوە كە حەز دەكەن ببن بە دەنگی نەبزوێنی دووەم ($c_2$) لە خانەی گیرفانی دامێنی بڕگەدا و چێوەی بڕگەكە بكەن بە بڕگەی گران, بە هێمای ($CVc_1c_2$)، وەك جێگەی دەنگی /د/ لە ئەم وشانەدا (ئارد، سارد، گرد، گەرد، كورد، مێرد، ....). یان, وەك جێگەی دەنگی /ت/ لە ئەم وشانەدا (ماست، مەست، دەشت، كەرت، كورت، پێست، وەشت، ...). وەك لە پێشەوە باسكرا، ئەو دوو نیشانەیەی ڕابردوو، حەز لە (بڕگەی گران) دەكەن، وەك ($CVcc$) و لە ئەو چێوەیەیشدا حەز دەكەن لە جێگەی دەنگی نەبزوێنی دووەم ($c_2$) لە گیرفانی دامێندا (گ د)، وەك ($CVc_1c_2$). بۆ نموونە، ئەو كارانەی كە لە نەخشەی (٣/٥)دا ڕیزكراون ڕیزبەندی دەنگسازیان ڕێ دەدات كە نیشانەی ڕابردوو لە سەر كورسی ($c_2$) ئاكنجی بكەن, لە بڕگەی ($CVc_1c_2$)دا. هەر لەبەر ئەوە، كێشەكەیان زۆر ئاساییە و پێویست بە ئەوە ناكات كە جێ خۆش بكرێت بۆ نیشانەكانی ڕابردوو بۆ ئەوەی بە ئنجی دابنشین. بەهەمان شێواز، دەتوانین نەخشەی (٤/٥) بخەینە ڕوو و ئەو كارانەی تێدا ڕیز بكەین كە جێی نیشانەی ڕابردوو یان (/د/ و /ت/) خۆشكردنی دەوێت.

| نیشانە | هێز | نموونەی چاوگەكان |
|---|---|---|
| نیشانەی رابردوو /د/ | تێنەپەڕ | لێ بوردن، مردن، .... |
| | تێپەڕ | بژاردن، بواردن، خایانـدن، خوێنـدن، دەڵانـدن، ژەنـدن، ژماردن، سەندن، سپاردن، پەساردن، شاردنـ (ەوە)، چانـدن، (هـەڵ) كەنـدن، لاوانـدن، نـاردن، ناسـاندن، نواندن، ... |
| نیشانەی رابردوو /ت/ | تێنەپەڕ | ئاخاوتن، خەوتن، سرەوتن، كەوتن، ... |
| | تێپەڕ | پاراستن، پـاڵاوتن خـواتن، ژەنـەوتن، رشـتن، چێشـتن، گاستن، گرتن، گلۆفتن، گواستنـ(ـەوە)، قۆزتنـ (ەوە)، كرۆشتن، لیستنـ (ەوە)، ناشتن، هاوێشتن، ویستن، ... |

نەخشەی (٣/٥): دابەشبوونی ئاسایی وەك دەنگی دووەم لە گیرفانی دامێندا.

| نیشانە | هێز | نموونەی چاوگەكان |
|---|---|---|
| نیشانەی رابردوو /د/ | تێنەپەڕ | ...... |
| | تێپەڕ | بردن، خواردن، كردن، .... |
| نیشانەی رابردوو /ت/ | تێنەپەڕ | رۆیشتن، گەیشتن, گوتن، هاتن، .... |
| | تێپەڕ | بەستن، بیستن، پەرستن، خستن، .... |

نەخشەی (٤/٥): دابەشبوون وەك دەنگی دووەم لە گیرفانی دامێندا

لە راستیدا، ئەو كارانەی كە لەسەر نەخشەی (٤/٥) ریزكراون هەر هەموویان كێشەدارن، چونكە ناتوانن پێشوازی بكەن لە نیشانەی رابردوو، مەگەر بە (جێگە خۆشكردن). هەر بۆ نموونە، هەندێك لە ئەو كارانە بنجی رانەبردوویان زۆر ناسك و شلوشاوە و پێویست بە (پتەوكردن) دەكات، بە هەندێك دەنگی لەبار لە جێگەی دەنگی بزوێنی یەكەم ($c_1$)، بۆ ئەوەی نیشانەكانی رابردوو (د، ت) بتوانن لەسەر كورسی ($c_2$) دابنیشن. یان، هەندێكی تریان بنجەكەیان زۆر پتەوە و نیشانەی رابردوو بەرەو (خپكردن) دەبەن، وەك لە سەر نەخشەی (٥/٥) ریزكراون. بۆ نموونە، ئەگەر قەدی رابردوو، كە بریتیە لە (بنج + نیشانەی رابردوو)، خۆش نەكرابا، ئەوا لە جیاتی (كرد) و (برد)، (كە ـ د) و (بە ـ د) ریز دەبوون، یان ئەگەر قەدی (گەیشت) و (نوست) خۆش نەكرابان، ئەوا بە (گە ـ ت) و (نو ـ ت) ریز دەكران. كەواتە، هەردوو نیشانەی رابردووی /د/ و /ت/ گەزافی خۆیان هەیە و دەبێت جێیان بۆ خۆش بكرێت، تا لە سەر كورسی ($c_2$) دابنیشن، لە گۆكراوی (قەدی كار)دا. هەر لەبەر ئەوە، دەنگی /ر/ كراوە بە دەنگی ($c_1$)، تا دەنگی نیشانەی رابردوو/د/ ببێت بە ($c_2$) لە قەدی (كرد) و (برد)دا. ئەوەیش لە یاد نەكەین كە خواستنی دەنگی /ر/ هەل و مەرجی خۆی هەیە و دەنگی نیشانەی رابردوو/د/ حەز دەكات بكەوێتە پاش دەنگی /ر/ و ئەو دەنگە زاڵ بكات، بەلام دەنگی نیشانەی رابردوو /ت/ دەنگی/س/ یان دەنگی/ش/ زاڵ دەكات. بەواتایەكی تر، حوكمەكە هی نیشانەی رابردوە، نەك هی بنجەكە. تەنانەت، نیشانەی /ت/ لە كاری (گەیشتن) و (رۆیشتن)دا داوای دەنگی/ی/ كردوە، سەرەرای/ش/، چونكە بزوێنەكانی (ـە) و (ۆ) بە پتەوی ماونەتەوە و برگەی (یشت) بوە بە برگەی گران ($CVc_1c_2$). لە ئەم روەوە، هیچ بنجێك نیە كە توانیبێتی دەنگی /ـە/ و دەنگی /ۆ/ بپارێزێت و نەی گۆرێت بە زەبری نیشانەكان رابردوو /ت/ و /د/. بۆ نموونە، كارەكانی (بردن، كردن، خستن) دەنگی /ـە/

یان تواندوەتەوە، بەڵام كاری (گەیشتن) پاراستوویەتی، هەر لەبەر ئەوە دەنگی/ی/ی پەیداكردوە. یان كاری (رۆیشتن)، دەنگی /ۆ/ی پاراستوە بەڵام دەنگی/ی/ خواستوە.

| جۆری بنج | چاوگ | بنجی رانەبردوو | قەدی خۆش نەكراو | قەدی خۆشكراو |
|---|---|---|---|---|
| بنجی ناسك | بردن | بە | بە ـ د | برد |
| | خواردن | خۆ | خۆ ـ د | خوارد |
| | كردن | كە | كە ـ د | كرد |
| | رۆیشتن | رۆ | رۆ ـ ت | رۆیشت |
| | گەیشتن | گە | گە ـ ت | گەیشت |
| | نوستن | نو | نو ـ ت | نوست |
| | خستن | خە | خە ـ ت | خست |
| بنجی پتەو | بەستن | بەست | بەست : ت | بەست |
| | بیستن | بیست | بیست : ت | بیست |
| | پەرستن | پەرست | پەرست : ت | پەرست |

نەخشەی (٥/٥): كێشەكانی هەردوو نیشانەی رابردوو /د/ و /ت/

### ٤/٥: حوكمەكانی نیشانەی رابردوو /ت/:

١- نیشانەی رابردوو /ت/ تەنها و تەنها هەر لە یەك كاردا دەكەوێتە پاش بزوێنی (ا)، وەك رێژەی (هات) لە كاری (هاتن)دا. بێگومان لەمێژەدا، دەنگی /ت/ بە تەنیا لە گیرفانی دامێنی بڕگەی (CVc)دا دانیشتوە.

٢- نیشانەی رابردوو /ت/ ناهێڵێت بزوێنی (ێ)ی قەڵەو لە ریزەكەدا بێت و ئەگەر هەبێت ئەوا دەی دەخاتە بەر چارەسەری دەنگسازیانە، وەك:

دەرێسم ← رستم

دەچێژم ← چەشتم

دەپارێزم ← پاراستم

دەرێژم ← رشتم

دەگوێزمەوە ← گواستمەوە

دەنێژم ← ناشتم

دەهاوێژم ← هاویشتم

٣- نیشانەی رابردوو /ت/ ناهێڵێت دەنگی /ز/ و دەنگی /ژ/ بەبێ گۆڕانكاری دەنگسازی بپەڕێنەوە. بۆ نموونە، لە ئەم كارانەدا دەنگی /ز/ خزاوەتە سەر ئەلەفۆنێك لە چەشنی /س/ و دەنگی /ژ/ خراوتە سەر ئەلەفۆنێك لە چەشنی/ش/، وەك:

چەژتم ← چەشتم

پارزتم ← پارستم

رژتم ← رشتم

گوازتمەوە ← كوستمەوە

نازتم ← ناشتم

هاوژتم ← هاوشتم

كرۆژتم ← كرۆشتم

گەرتم ← گەستم

خوارتم ← خواستم

كوژتی ← كوشتی

٤- وەك لە پێشەوە باسكرا، نیشانەی ڕابردوو /ت/ حەز دەكات كە ببێت بە دەنگی ($c_2$) لە گیرفانی دامێنی بڕگەدا، وەك دەنگی /ت/ لە وشەكانی (ماست، مەست، دەشت، گۆشت، پۆشت، پێست، ...)دا. واتە، دەنگی /ت/ لە ئەو وشانەدا و لە قەدی ڕابردوودا، وەك (گاست، ناشت، ...)، جێگەی دەنگی ($c_2$) پڕ دەكاتەوە، چونكە نیشانەی ڕابردوو (ت) ئەو كورسیە بەرنادات. هەر لەبەر ئەو هۆیە، ڕیزی دەنگسازیانەی بڕگە بە جۆرێك هەموار دەكات كە خۆی جێی دەنگی ($c_2$) بگرێت لە چێوەی بڕگەی ($CVc_1c_2$)، وەك لە نموونەكانی خاڵی دوەم و سێیەمدا هاتوە.

٥- لە بەر ڕووناكی خاڵی (٢) و خاڵی (٤)، تەنانەت ئەگەر دەنگی /ز/ و /ژ/ لە ڕیزەكەدا نەبێت، كە بیان گۆڕێت، ئەوا لە دەرەوەی قەوارەی ئاخاوتنەكە قەرزی بۆ دەكات، وەك:

دەنووم ← نوستم

دەڕۆم ← ڕۆیشتم

دەگەم ← گەیشتم

دەخەم ← خستم

٦- هاتنی دەنگی /ی/، لە ئەو نموونانەدا كە دەنگی/ش/ سەپێنراوە، دەگەڕێتەوە بۆ ژینگە دەنگسازیەكەی دەنگی/ش/، كە خۆی جودا دەكاتەوە لە بڕگەی (گە) و (ڕۆ) لە كاری (گەیشتن) و (ڕۆیشتن)دا.

٧- لە سێ كاردا, وەك (بەستن، بیستن، پەرستن), بە ڕێكەوت دەنگی كۆتایی لە بنجەكان (بەست، بیست، پەرست) یەكسانە بە هەمان دەنگی /ت/، كە بریتیە لە نیشانەی ڕابردوو. لە هەمان كاتدا, ئەم سێ بنجە بە خۆڕسكی چێوەی برگەی گران ($CVc_1c_2$) ڕسكاون و كورسی ($c_2$)یان تەرخانكردوە بۆ دەنگی /ت/ لە بنجە ڕانەبردوەكەدا. واتە, جێگەی نیشانەی ڕابردوو ($c_2$) زەوتكراوە و كۆنەندامی ئاخاوتنیش بە ناچاری خپی دەكات، وەك: (دارەكەم بەستـ ـ). لە ئێرەدا، جێگا ($c_2$) داگیركراوە لە لایەن دەنگی كۆتایی لە بنجەكە /ت/. هەر لە بەر ئەو سەدەمە نیشانەی ڕابردوو /ت/ خپ دەبێت، چونكە ئەگەر بمێنێتەوە, دەبێت برگەی (تت) دروست بكات و بزوێنی (بزرۆكە) پەسند بكات و بچێتە سەر برگەكەی پاش برگەی قەدی كارەكە.

## ٥/٥: حوكمەكانی نیشانەی ڕابردوو/د/:

حوكمەكانی نیشانەی ڕابردوو/د/ زۆر ئاڵۆز نین، بەڵام باندۆری خۆیان هەیە لە سەر دەنگسازی، وەك:

١- نیشانەی ڕابردوو/د/ گشت دەنگێكی بزوێن، لە چەشنی /ێـ/ دەگۆڕێت بە /ا/، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| دەبژێرم | : | بژاردم |
| هەڵ دە بوێرم | : | هەڵم بوارد |
| دەخاپێنێت | : | خاپاندی |
| دەدەلێنێت | : | دەلاندی |
| دەژمێرین | : | ژماردمان |
| دەچێنیت | : | چاندت |
| دەنێرن | : | ناردیان |
| دەنوێنم | : | نواندم |

لە گشت ئەو نموونانەدا، بە زەبری نیشانەی ڕابردوو /د/, لە قەدی ڕابردوودا دەنگی /ێ/ گۆڕاوە بە /ا/. تەنها لە كاری (خوێندن)دا، دەنگی/ێ/ خۆی دەگرێت و ناگۆڕێت بە /ا/.

٢- ئـەو كێشـەیەی لـە خـاڵی (١)دا باسـكراوە، لـە ڕاسـتیەكەوە پەیـدا دەبێـت كـە نیشـانەی ڕابردوو/د/ گشت كاتێك جێی دەنگی ($c_2$) پڕدەكاتـەوە لـە بڕگـەی ($CVc_1c_2$)دا. لـە هەمان كاتدا, لە گشت فۆرمێكدا دەكەوێتە پاش دەنگی /ر/ی سـووك، یـان دەنگی /ن/. تەنانەت، لە هەردوو كاری (كردن) و (بردن)دا، نیشانەی ڕابردوو/د/، داوای دەنگی /ر/ دەكات و بە زۆر دەی خاتە نێو ریزەكە، وەك:

ئیش دە (كە) ین : ئیشمان (كە ـ د)* : ئیشمان (ك[redacted]د)

پارە دە (بە) ین : پارەمان (بە ـ د)* : پارەمان (ب[redacted]د)

٣- وەك پاشكۆیەك بۆ خاڵی دوەم، گشت كارێكی (ئاندن) نیشـانەی ڕابـردوو/د/ هـەڵ دەگرێت و ئەو نیشانەیە گشت كاتێك دەنگی /ێـ/ لە (ێن)دا دەگۆڕێت بە /ا/ وەك (ان)، وەك لە ئەم ڕستانەدا دیارە:

دەسووتـ (ێـنـ)ـم : سووتـ (انـ)ـدم

دە زریكـ (ێـنـ)ـم : زریكـ (انـ)ـدم[17]

## ٦/٥: پوختەكاری:

- كاتێك كە هەردوو نیشانەی ڕابردوو/د/ و /ت/ فەرمانی خۆیان دەسەپێنن, بـە ئـەوەی كە دەبێت لە جێی ($c_2$) دابنیشن, لە بڕگەی گرانی ($CVc_1c_2$)دا، كارلێكی دەنگسازی دەكەوێتە نێو ڕەگی ڕابردووی كارەكە.

[17] هەندێك لە مامۆستایانی زانكۆ بە جۆرێك نەلەمۆرێ (ان) شرۆڤە دەكەن كە زۆر نامۆیە لە شیكاری زانستی.

- بە شێوازێكی جیاواز لە نیشانەكانی تری رابردوو (یێ، وو، ی)، هەردوو نیشانەی /ت/ و/د/ بە تەنها (نەبزوێن)ن و كێشەی جێ خۆشكردنیان زۆرترە.
- نیشانەی رابردوو/د/ بە سستی دەكەوێتە پاش دەنگی /ن/، یان دەنگی /ر/، بەبێ ئەوەی بزوێنی بزرۆكە (بزرۆكە) پەسەند بكرێت لە نێوانیاندا.
- هەردوو نیشانەی رابردوو /د/ و /ت/ حەز ناكەن كە دەنگی /ێ/ بكەوێتە نێو ریزی قەدی كارەوە. هەر لەبەر ئەوە, دەی گۆڕن بە دەنگی/ا/.
- نیشانەی رابردوو /ت/ دەنگی /ز/ و /ژ/ دەگۆڕێت بۆ دوو ئەلەفۆن لە چەشنی/س/ و/ش/. بە داخەوە, لە رێنووسی كوردیدا, ئەم دوو ئەلەفۆنە بە گرافیمی /س/ و/ش/ رێنووس دەكرێن, كە نەدەبا ئاوەهابا. واتە, دەبا لە جیاتی (گەستن, كوشتن, ...) بنووسرابا (گەزتن, كوژتن, ...).
- لە كاری (نوستن و خستن)دا، نیشانەی رابردوو /ت/ دەنگی/س/ دەسەپێنێت بەسەردا و لە دەرەوەی قەوارەی كارەكانەوە پەیدای دەكات.
- لە كاری (رۆیشتن) و (گەیشتن)دا، نیشانەی رابردوو /ت/ بڕگەی (یش) دەسەپێنێت بەسەردا.
- بەرێكەوت لە هەر سێ كاری (بەستن، بیستن، پەرستن) دەنگی كۆتایی لە بنجەكەیان بریتیە لە دەنگی /ت/ و نیشانەی رابردوویش هەر بریتیە لە /ت/. لە ئەم هەل و مەرجەدا, وەك كورسی ($c_2$) لە بڕگەی (بەست، بیست، پەرست)دا گیراوە لە ریزی ($CVc_1c_2$)دا, نیشانەی رابردوو /ت/ ناچار دەبێت كە خۆی خپ بكات. مەگەر هەر بە زەبری (بزوێن) بخوێنرێتەوە، وەك:

تو بەست : (ـتت), ئێمە بەست (ـتمان), ئەو بەست (ـتێ)

- لە ئەو كارانەدا، كە بنجەكەیان بریتیە لە بڕگەی پڕ ($CVc$)، نیشانەی رابردوو /ت/ دەبێت بە دەنگی ($c_2$) لە ریزی ($CVc_1c_2$)دا.

# بابەتی شەشەم

## نیشانەكانی رابردوو و نیشانەكانی جۆری رابردوو[١٨]

### ١/٦: دەسپێك:

لە ئاستی نیشانەكانی رابردوودا، كە بریتین لە (ا، د، ت، وو، ی)، رێزمانی كوردی درێغی نەكردوە و زۆر بە جوانی پیشاندراوە. جوانترین كرداریش لە ئەو بوارەدا بریتیە لە ناونانی چاوگەكانی زمانی كوردی بە پێی نیشانەكانی رابردوو، وەك: (چاوگی ئەلفی، چاوگی دالی، چاوگی تائی، چاوگی واوی، چاوگی یائی). لە راستیدا، ئەم جۆرە ناونانە پۆلێنكردنێكی زۆر كاریگەری خستوەتە روو, كە دەشێت هەر هەمووومان كەلكی لێ وەربگرین و پەتەوتری بكەین. بۆ نموونە, چاوگی (ئاندن) لە جۆری (دالی)ی تێپەڕە و چاوگی بكەرنادیاریش لە جۆری چاوگی (ئەلفی) تێنەپەڕە. ئەم دوو جۆرە چاوگە هەرچەندە (بنجی) نین, كەچی ملكەچن بۆ رێساكانی ئەو دوو خێزانە كارە. سەبارەت بە نیشانەكانی جۆری رابردوو، كە تەنها رابردووی دوور و رابردووی تەواو دەگرێتەوە، درێخی هەیە، چونكە رەگێشەی ئەو نیشانانە دەرنەخراوە. تەنانەت, كێشەكانی رێنووسی (رابردووی تەواو)یش چارەسەر نەكراون. لە ئەم نووسینەدا، روو دەكەین لە گشت بابەتەكە و زوومێكی تایبەتی دەخەینە سەر نیشانەكانی (جۆری رابردوو)، كە بریتیە لە (بوو) بۆ رابردووی دوور و دەنگی /و/ بۆ رابردووی تەواو.

---

[١٨] گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٠)، هەولێر ٢٠٠٨.

## ٢/٦: نیشانەكانی دەمكاتی رابردوو:

وەك لە رێزمانی كوردیدا ساخ بوەتەوە، پێنج نیشانەی رابردوو هەیـە، وەك (ا، د، ت، وو، ی). ئەم نیشانانە بەراستەوخۆیی لە بنیادی چاوگی كارەكاندا دەردەكەون. لـە سـەر نەخشەی (١/٦)، گشت جۆرەكانی نیشانەی رابردوو نموونە رێز كراون.

| چاووگ | تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|---|
| چاوگی ئەلفی | سووتان | كێلاّن |
| چاوگی دالی | مردن | بردن |
| چاوگی تائی | كەوتن | پالاّوتن |
| چاوگی واوی | چوون | دروون |
| چاوگی یائی | وەرین | نووسین |

نەخشەی (١/٦): نموونەڕێزكردنی چاوگی كارەكان.

بەرانبەر بە ئەم نموونانە، نیشانەكانی دەمكاتی رابردوو دابەش دەبن بەسەر دوو پۆلدا. پۆلی یەكەم بریتیە لە (نیشانە بێ برِشتەكان) و پۆلی دوەم بریتیە لە (نیشـانە بـە برِشتەكان). لە پۆلی یەكەمدا، كە نیشانەكانی (ت، وو، ی) دەگرێتەوە، مەودای زۆر بـوونی ژمارەی چاوگەكان نیە و هیچ رێچكەیەكی رێزمـانی ئـەوتۆ نیـە كـە برِشـتیان پـێ بـدات و ژمارەیـان زۆر بكـات. لـە بەرانبـەردا، نیشـانەكان پـۆلی دوەم، (د) و (ا)، بەبرِشـتن و رێزمانەكە رێ دەدات كە ژمارەی چاوگەكانیان زیاد بكات، بەئەم چەشنە:

(١): نیشانەی رابردوو دال (د):

یەكەم: ئەم نیشانەیە بێچگە لە چاوگی بنجی، چاوگی (ئانـدن)ی هەیـە، كـە گشـت چاوگە بنجییــە تێنەپــەڕەكان دەكــات بــە چــاوگی (دالــی). بــۆ نموونــە، هــەر پێــنج نموونــە تێنەپەڕەكەی سەر نەخشەی (١/٦) دەبن بە (ئاندن)، كە لە جۆری (دالی)یە، وەك:

سووتان (ئەلفی): سووتانـدن (دالی)

مردن (دالی): مراندن (دالی)

كەوتن (تائی): كەواندن (دالی)

چوون (واوی): چواندن (دالی)

وەرین (یائی): وەراندن (دالی)

ئەم چاوگانە (تێپەڕی دالی)ن و دەتوانن، لە نەخشەی (١/٦)دا، لـە گـەڵ نموونـەی چاوگی تێپـەڕی دالـی (بـردن) ریـز بـبن. كەواتـە، چاوگی (ئانـدن) گشـت كـارە تێپـەڕەكان دەكات بە (تێپەڕ) و لە گەڵ (چاوگی دالـی تێپـەڕ) ریزیـان دەكـات. لـە ئـەم میكانیزمـەدا، تەنها چەند كارێك هەیـە كـە بـە گرانـی چـاوگی (ئانـدن) پەسـەند دەكـەن، وەك كارەكـانی بزرووتن:(چوون، هاتن، رۆیشتن)، چونكە بكەری رسـتەكەیان لـە جـۆری چـالاكە و ناشـێت بكرێت بە (بەركار)، كە سستە.

دووەم: لەلایەكی ترەوە، چاوگی (ئاندن) روو دەكات لە هەموو دەنگە سروشتیـەكان، وەك:

چریكە + (اندن) ← چریكاندن (دالی)

نەڕە + (اندن) ← نەڕاندن (دالی)

شیرە + (اندن) ← شیراندن (دالی)

بێگومان، ئەم جۆرە چاوگانە تێپەڕن بە (ڕێزمان) و تێنەپەڕن بە (واتا)، چونكە كۆلكەی (بەركار) وەرناگرن. بە ڕاستی، ئەم جۆرە كارە ژمارەیان زۆرە و تا ئێستا نزیكەی (١٠٠) سەد نموونەمان ئامار كردوە[١٩]. لە گەڵ ئەوەیشدا، چاوگی (ئاندن) چەند ئاكارێكی هەیە، وەك:

١- چاوگی (ئاندن) بریتیە لە دەروازەیەكی ڕێزمانی والا بەرووی هەر دەنگێكدا، كە لە سروشتەوە، پەردەی گوێ بی ژنەوێتەوە.

٢- بە پێی خاڵی پێشوو، ژمارەی ئەم جۆرە چاوگە كراوەیە و سنوور دار نیە. بۆ نموونە، ئەگەر ئامێرێك دابهێنرێت و ئەو ئامێرە دەنگێكی تازە دەربكات لە چەشنی (زڤە)، دەتوانین ڕاستەوخۆ چاوگێك چێ بكەین لە چەشنی (زڤاندن). لە پاشتردا، گەرداننامەیەك بۆ ئەو كارە چێ بكەین.

٣- چاوگی (ئاندن) هەرچەندە تێپەڕە، بەڵام سستە و (بەركار) وەرناگرێت، چونكە دەنگە سروشتییەكە بوە بە (بنج)ی چاوگی بۆشی (ئاندن) و ئەو بنجە واتای (بەركار) هەڵ دەگرێت.

٤- لە بەر ڕووناكی خاڵی پێشوو، كاری دەنگە سروشتیەكان ناتوانن ببن بە (بكەرنادیار)، چونكە (بەركار)ی ڕستەكە هەرس بوە لە واتادا و بوە بە (بنج) و بە ئاسانی جودا ناكرێتەوە، تا بكرێت بە (جێگری بكەر).

**سێیەم:** بە پێی ئەوەی تا ئێستا باسكرا، نیشانەی ڕابردوو (د) سێ سەرچاوەی هەیە، وەك:

| | |
|---|---|
| سەرچاوەكانی نیشانەی ڕابردوو (د) | ١- چاوگی بنجی، وەك (مردن)، (بردن)<br>٢- چاوگی ئاندن، وەك (سووتاندن)<br>٣- چاوگی دەنگی سروشتی (چریكاندن) |

[١٩] بڕوانە بۆ كتێبی (گەشتێك بە نێو ڕێزمانی كاردا، بەشی هەشتەم)، هەولێر ٢٠١٦.

لە ئەم خشتەیەدا، سەرچاوەی یەكەم (چاوگی بنجی دالی) ژمارەیان دیاری كراوە، بەڵام زۆر كەمن. سەرچاوەی دووەمیش (چاووگی ئانـدن)، پانتـایی گشت چاوگە بنجیـە تێنەپەڕەكان دەگرێتەوە. بۆ نموونە، ئەگەر (١٠٠) سەد چاوگی بنجی تێنەپەڕی (ئەلفی، دالی، تائی، واوی، یائی) هەبێت، ئەوا ئەو سەد چاوگە دەبن بەچاوگی (ئاندن). سەبارەت بە سەرچاوەی سێیەم (چاوگی دەنگە سروشتیەكان)، ئەم جۆرە چاوگە ژمارەكەیان سنووردار نیە و دەشێت بە پێی (دەنگی سروشتی) ژمارەیان زۆر بكات.

**٢- نیشانەی رابردوو (ا):**

**<u>یەكەم</u>:** نیشانەی رابردوو (ا) هەر لە چاوگی بنجیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵكو دوو سەرچاوەی تری هەیە، كە بریتین لە هەردوو جۆرەكەی (چاوگی بكەرنادیار). لەراستیدا، بێجگە لە چەند نموونەیەكی نارێك، سەرپاكی كاری زمانەكە روو دەكەن لە چاوگی (بكەرنادیار). ئەوەیش لەیاد نەكەین كە سەرپاكی كاری (بكەرنادیار)، سێ ئاكاری رێزمانی هەڵ دەگرن:

١- هەر هەموویان لە كاری (تێپەڕ)ەوە رۆدەنرێن.
٢- هەرهەموویان نیشانەی رابردوو (ا) هەڵ دەگرن.
٣- هەر هەموویان، لە رووی هێزی تێپەڕینەوە، تێنەپەڕن.

سەبارەت بە ئەو سەرچاوانەی كە برشتی نیشانەی رابردوو (ا) زۆر دەكەن، گشت كارە تێپەڕە بنجیەكان دەبن بە (بكەرنادیار)، وەك:

كێڵان (ئەلفی) ← كێڵران (ئەلفی)

بردن (دالی) ← بران، (بردران) (ئەلفی)

پالاوتن (تائی) ← پالێوران (ئەلفی)

دروون (واوی) ← درووران (ئەلفی)

نووسین (یائی) ← نووسران (ئەلفی)

دووەم: لە رێچكەی دووەمدا، هەر كارێكی تێنەپەڕ، كە بكرێت بـە كـاری (ئانـدن)، دەبێـت بـە (تێپەڕ) و ئەمجا ئەو كارە بۆی هەیە ببێـت بە (بكەر نادیار)، وەك:

سووتان (ئەلفی) ← سووتاندن(دالی) ← سووتێنران (ئەلفی)

مردن (دالی) ← مراندن (دالی) ← مرێنران (ئەلفی)

كەوتن (تائی) ← كەواندن (دالی) ← كەوێنران(ئەلفی)

چوون (واوی) ← چواندن (دالی) ← چووێنران(ئەلفی)

وەرین (یائی) ← وەراندن (دالی) ← وەرێنران(ئەلفی)

سێیەم: بـەپێی خـاڵی یەكـەم و دووەم، چـاوگی ئـەلفی تێنەپـەڕ (بكـەرنادیار) گشت كـاری زمانەكـەمان دەگرێتـەوە. بـۆ نموونـە، ئەگـەر (١٠٠) كـاری تـێ نەپـەڕ و (١٠٠) كـاری تێپـەڕ هەبێت، ئەوا (٢٠٠) دووسەد كاری تێ نەپەڕی ئەلفی زیاد دەكـەن لـە كـۆی چاوگە ئەلفیـە بنجیەكان، وەك:

| | |
|---|---|
| سەرچاوەكانی نیشانەی رابردووی (ئەلفی) | ١- چاوگی بنجی، وەك (سووتان)، (كێلان)<br>٢- چاوگی بكەرنادیار لەچەشنی (بردن ← بردران)<br>٣- چاوگی بكەر نادیار لەچەشنی<br>(سووتان ← سووتاندن ← سووتێنران) |

لە سەرچاوەی یەكەمدا، چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ ژمارەی یەكجار زۆرە و نیوەی ڕاستی كارە بنجییەكان (تێنەپەڕ و تێپەڕ) لە ئەم خێزانەن. لەسەرچاوەی دوەم و سێیەمدا، هەر چی كاری تێنەپەڕ و تێپەڕی بنجی هەیە، دیوی ئەلفی (بكەرنادیار)یان هەیە. كەواتە، چاوگی ئەلفی (لە هەر سێ سەرچاوەكەوە) بەربلاوترین جۆرن و لە ئەو جۆرەدا، تەنها چەند چاوگێكی تێپەڕی بنجی هەیە، كە ژمارەیان زۆر زۆر كەمە (وەك: كێلان، پیوان، كێشان، دان، ...)، ئەگەر بەراورد بكرێن بە رووبەری كارە ئەلفی تێنەپەڕەكان.

## ٣/٦: نیشانەی رابردووی دوور:

لە زمانی كوردیدا، سەرپاكی كارەكانی (رابردووی دوور) نیشانەی (...بوو) هەڵ دەگرن و ئەم نیشانەیە بە روخسارێكی پتەوەوە ئامادەیی خۆی پیشان دەدات لە ریزەكەدا، بەئەم چەشنە:

**یەكەم:** بە هاتنی نیسانەی رابردووی دوور (بوو)، نیشانەكانی رابردوو وەك خۆیان دەمێننەوە و بە هیچ جۆرێك ناگۆڕێن، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| سووتـ (ا) | : | سووتـ (ا) بوو |
| مر (د) | : | مر (د) بوو |
| رۆیشـ (ت) | : | رۆیشـ (ت) بوو |
| وەر (ی) | : | وەر (یـ) بوو |
| چ (وو) | : | چ (وو) بوو |

دوەم؛ تەنانەت، نیشانەی (دالی) لە چاوگی ناسادەی (ئانـدن)دا وەك خۆی دەمێنێتـەوە بـە دالی، وەك:

سووتانـ (د)م : سووتانـ (د) بووم

مرانـ (د)م : مرانـ (د) بووم

وەرانـ (د)م : وەرانـ (د) بووم

**سێیەم؛** نیشانەی ئەلفی (ا) لە (بكەر نادیار)یشدا دەپارێزێت و ناگۆڕێت، وەك:

سووتێنرا : سووتێنرا بوو

مرێنرا : مرێنرا بوو

وەرێنرا : وەرێنرا بوو

**چوارەم؛** نیشانەی جۆری رابـردوو (بـوو) بـە هـیچ جۆرێـك جێـی خـۆ ناگۆڕێـت، هـەموو جارێكی نووكەكەی كە بریتیە لە دەنگی (بـ) دەنووسێت كلكی بـە (نیشـانەی رابـردوو)دوە لە چەشنی (ا، د، ت، وو، ی)، وەك:

سووتا : سووتـ (ابوو)

مرد : مر (دبوو)

كەوت : كەو (تبوو)

چوو : چـ (وو بوو)

وەری : وەر (یبوو)

كەواتە، چەند ڕاستیەك دەچەسپێن لە ریزمانی ڕابردووی دووردا، وەك:

(١): هیچ گەردیلەیەكی ڕێزمانی ناكەوێتە نێوان (نیشانەی ڕابردوو) و (نیشانەی جۆری ڕابردوو)، چونكە هاوخانەی یەكترین لە پلیكانەی ڕستەدا، ئەمیان لە خانەی (-٣)دایە و ئەویان لە خانەی (+٤)دا. لە رووی ڕێنووسەوە، ناشێت و نابێت هیچ (كەلێن)ێك بخرێتە نێوان ئەو دوو ڕەگەزە ڕێزمانیە. بۆ نموونە نابێت بنووسین (وەری بوو)، دەبێت بنووسین (وەریبوو).

(٢): هەبوونی یەكێك لە نیشانەكانی ڕابردوو مەرجە بۆ ریزبوونی نیشانەی ڕابردووی دوور (بوو)، چونكە هەبوونی لە ریزەكەدا پشبەستە بە هەبوونی (نیشانەی ڕابردوو) لە پێشی.

(٣): بە پێی ئەو دوو خاڵەی پێشەوە، نیشانەی ڕابردووی دوور (بوو) بریتیە لە (پاشكۆ)یەك بۆ نیشانەكانی ڕابردوو، چونكە بەبێ ئەو مۆرفیمانە هیچ نرخێكی نیە لە رژێمی ڕستەدا.

پێنجەم: چی گوتراوە بۆ ئەو نموونە تێنەپەڕانەی سەرەوە، دەچەسپێت بە سەر كاری (تێپەر)دا. واتە، هەر یەك نیشانەی ڕابردووی دوور هەیە، كە بریتیە لە (بوو)، چی بۆ (تێپەڕ) و چی بۆ (تێنەپەڕ). ئەو نیشانەیە گشت كاتێك لە نووكەوە دەلكێت بە نیشانەیەكی ڕابردووەوە.

## ٤/٦: ڕەگێشەی نیشانەی ڕابردووی دوور:

لە زمانی كوردیدا زۆر ئاسانە ڕەگێشەی نیشانەی جۆری ڕابردوو (بوو) بدۆزرێنەوە. لە نەخشەی (٢/٦)دا، ئەو شەش نموونەیە هەر شەش كەسە ڕێزمانیەكە دادەپۆشن. لە هەر شەش نموونەكەدا، خوێندنەوەی نموونەكانی ستوونی یەكەم شەش

رێژەی رابردووی دوور نیشان دەدەن بۆ كاری تێنەپەڕی (خـەوتن), بـەڵام خوێندنـەوەی ئەوانەی ستوونی دووەم شەش رێژەی رابردووی كاری (بـوونی ئێستایی) دەخەنـە روو. لـە بەرانبـەردا، دەتـوانین بڵـێین: (رێـژەكانی رابـردووی دوور بـە رێـژە رابردووەكـانی بـوونی ئێستایی رۆنراون), چونكە بـە دەرهێنـانی قـەدی رابـردووی (خـەوت) لـە نموونـەكانی لای راست, نموونەكانی لای چەپ دەردەكەون, كـە بـریتین لـە سـێتە رێـژەی كـاری (بـوون). بـە واتایـەكی تـر و بـە تـێ گەیشتنێكی تـر، مـاكی نیشـانەی جـۆری رابـردوو (بـوو) لـە كـاری (بوونی ئێستایی)یەوە پەڕیوەتە سەر رێژەكانی (رابردووی دوور)

| رابردووی دوور | رابردووی بوون |
|---|---|
| من خەوت بووم | من ـــــ بووم |
| تۆ خەوت بوویت | تۆ ـــــ بوویت |
| ئەو خەوت بوو(-) | ئەو ـــــ بوو(-) |
| ئێمە خەوت بووین | ئێمە ـــــ بووین |
| ئێوە خەوت بوون | ئێوە ـــــ بوون |
| ئەوان خەوت بوون | ئەوان ـــــ بوون |

نەخشەی (٢/٦): رەچەڵەكی نیشانەی رابردووی دوور (بوو).

سەبارەت بە كاری تێپەڕ، هەمان بۆچوون راستە، بەڵام جێناوەكان دەگۆڕێن. هـەر لەبەر ئەوە, كاری (بوونی ئێستایی)ی تێپەڕ وەر دەگرین. بە سەرنجێكی ورد لـە نەخشـەی (٣/٦) دەردەكـەوێت كـە نیشـانەی جـۆری رابـردوو بریتیـە لـە (بـوو)، بـەڵام جێناوەكـان یەكسان دەبن بە (روخسار) و بـە (ئـەرك) بـە ئەوانـەی كـاری (بـوونی ئێسـتایی)ی تێپـەڕ,

چونكە بە دەرهێنانی قەدی ڕابردووی كارەكە (هەڵ گرت)، لە نموونەكانی لای ڕاست، نموونەكانی لای چەپ دەردەكەون، كە بریتین لە سێتە ڕێژەی كاری (بوون)ی تێپەڕ.

| رابردووی دوور | رابردووی بوون |
|---|---|
| من هەڵم گرتبوو | من سەرمام ــــ بوو |
| تۆ هەڵت گرتبوو | تۆ سەرمات ــــ بوو |
| ئەو هەڵی گرتبوو | ئەو سەرمای ــــ بوو |
| ئێمە هەڵمان گرتبوو | ئێمە سەرمامان ــــ بوو |
| ئێوە هەڵتان گرتبوو | ئێوە سەرماتان ــــ بوو |
| ئەوان هەڵیان گرتبوو | ئەوان سەرمایان ــــ بوو |

نەخشەی (٦/٣): ڕەچەڵەكی نیشانەی ڕابردووی دوور (بوو) لە كاری تێپەڕدا.

## ٥/٦: نیشانەی ڕابردوو تەواو (وو):

لە زمانی كوردیدا، سەرپاكی ڕێژەكانی (ڕابردووی تەواو) نیشانەی (وو) هەڵ دەگرن، بەڵام ئەم نیشانەیە ڕوخسارێكی پتەوی نیە، وەك نیشانەی ڕابردووی دوور (بوو)، بەئەم چەشنە:

**یەكەم:** ئەم نیشانەیە بزافی (نیمچە بزوێنایەتی) دەنوێنێت و لە پاش هەردوو (نیشانەی ڕابردوو)ی نەبزوێن (د، ت) بە (بزوێنی) دەردەكەوێت و دەبێت بە دوو (واو) بنووسرێت، وەك:

من برد (-) م ← من برد (وو) مە

من ڕۆیشت (-) م ← من ڕۆیشـ (وو) م

یان، لە پاش هەدوو نیشانەی رابردووی بزوێن (ا، ی) دەگەوێت بە دیوی (نەبزوێن)دا و دەبێت بە یەك واو بنووسرێت، وەك:

دارەكە سووتا ← دارەكە سووتا (و) ە

گوڵەكە وەری ← گوڵەكە وەریـ (و) ە

سەبارەت، بە نیشانەی رابردوو (وو) كە هەمان روخساری هەیە و بە دوو (واو) دەنووسرێت، بارەكە زۆر ئاڵۆزە و تەنانەت رێنووسە فۆنیمیەكەیش كورت دەهێنێت لە ئاستی، چونكە ناشێت سێ (واو) بنووسرێت، وەك:

من چوو (-)م بۆ بازار ← من چـ(ـوو: و)م بۆ بازار

من كراسەكەم دروو ← من كراسەكەم در(وو: و)ە

دووەم: لەزاری ناوچەی هەولێردا، یان لە شێوازی كرمانجی ژووروودا، دەنگی /ی/ كراوە بە نیشانەی رابردووی تەواو. ئەم دەنگەش (نیمچە بزوێنە) وەك دەنگی /وو/ و هەمان كێشە دووبارە دەبێتەوە.

سێیەم: لە زاری هەندێك دەڤەردا، نیشانەی رابردووی تەواو بەدەنگی نەبزوێنی گاف (گ) خراوەتە بەر ئاخاوتن. لە راستیدا، ئەم دەنگە پتەوە گشت ئەو كێشانە چارەسەر دەكات كە لە خاڵێ یەكەمدا باسكراوە. هەر لەبەر ئەوە، لە سەر پێوانە، گشت نموونەكان دووبارە دەكەینەوە، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| من بر (وو) مە | ← | من برد(گـ) ـمە |
| من رۆیشتـ (وو) م | ← | من رۆیشتـ (گـ) ـم |
| دارەكە سووتا (و) ە | ← | دارەكە سووتا (گـ) ـە |
| گوڵەكە وەرێـ (و) ە | ← | گوڵەكە وەرێـ (گـ) ـە |
| من چـ(وو: و) م بۆ بازار | ← | من چوو (گـ)ـم، بۆ بازار |
| من كراسەكەم درووـ:وە | ← | من كراسەكەم درووـ(گـ)ـە |

لـە راسـتیدا، نیشـانەی رابـردووی تـەواو (گـ) كـەڵكێكی گـەورە دەبەخشـێت بـە (زمانی نووسین) و دەشێت رۆژێك لە رۆژان بی خەینەبەر برەو، لەبەر ئەم هۆیانە:

(١): دەربازبوون لە ئارێشەكانی دەنگی (نیمچە بزوێن)ی (وو) و (ی).

- (٢): كەمكردنەوەی گرفتەكانی نیشـانەی (وو)، كـە بـە(بـزوێنی) بـە دوو واو (وو) رێنووس دەكرێت و بە (نەبزوێنی) بە یەك واو (و) رێنووس دەكرێت.
- (٣): دۆزینەوەی چارەسەر بۆ هەردوو (نیشانەی رابردوو)ی نیمچە بزوێن، (وو) و (ی). هـەروەها, چارەسـەر كردنـی گرێكـوێرەی رێنووسـەكە لـە ئاسـتی لێكخشـانی كلكی نیشانەكانی رابردوو (ا, ی, وو) لە سەری نیشانەی رابردووی تەواو (وو), كە دراوسێن لە هەردوو خانەی (-٣) و (-٤)ی پلیكانەی رستەدا.

## ٦/٦: نیشانەی (بوو) و نیشانەی (وو) بە بەراورد:

لـە نێـوان نیشـانەی رابـردووی تـەواو (وو) و نیشـانەی رابـردووی دوور (بـوو)دا، چەند خاڵێكی یەكسانی و جیاوازی هەن، وەك:

**یەكەم:** وەك لە پێشەوە باسكرا، نیشانەی رابردووی دوور (بوو) پتەوە و نەگۆڕە، چونكە بڕگەیەكی تەواوی هەیە لە چەشنی (CVo). كەچی، نیشانەی رابردووی تەواو (وو) زۆر شلك و فرە روخسار و كێشەدارە، چونكە بڕگەیەكی ناتەواوی هەیە لە چەشنی (QVo). تەنانەت، لەگەڵ نیشانەی رابردوو (وو) گرێكوێرمیەكی بێچارە دەكەوێتە نێو ڕێنووسەكە، چونكە ناشێت سێ واو (ووو) ریز بكەین وەك (چووواوم) بە واتای (رۆیشتووم).

**دوەم:** هەردوو نیشانەكە، بریتین لە دوو (دیو) بۆ یەك رەگەزی ڕێزمانی، چونكە لە پلیكانەی رستەدا لە یەك خانەدا دادەنیشن (-٤). یان، بە هیچ جۆرێك لە یەك نموونەدا كۆ نابنەوە. خانەكەی ئەم دوو نیشانەیە بە خانەی (-٤) ناو نراوە لە ئیشەكانی ئێمەدا. ئەم خانەیە دەكەوێتە پاش خانەی نیشانەی رابردوو (-٣).

**سێیەم:** وەك درێژەیەك بۆ خاڵی پێشوو، هەروو نیشانەكە (سەربەخۆ) نین، چونكە دەركەوتنان لە هەر رستەیەكدا پشتبەستە بە هەبوونی (نیشانەی رابردوو) لە ریزەكەدا. واتە، تا خانەی (-٣) پڕ نەبێتەوە بە نیشانەیەكی رابردوو، خانەی (-٤) ناتوانێت نیشانەی رابردووی دوور و رابردووی تەواو هەڵ بگرێت.

**چوارەم:** نیشانەی رابردووی تەواو بە دوو ڕێنووس دەنووسرێت، یەك واو (و) لە پاش دەنگە بزوێنەكان و بە دوو واو (وو) لە پاش دەنگە نەبزوێنەكان. لە ئاستی نیشانەی (بوو)دا ئەم كێشەیە لە ئارادا نیە.

**پێنجەم:** نیشانەی رابردووی دوور (بوو) گشتگرە و باری ناوچەیی تێدا نیە، كەچی نیشانەی رابردووی تەواو نەلەمۆرفی ناوچەیی هەیە، وەك (وو، ی، گ).

## ٧/٦: ڕەگێشەی نیشانەی ڕابردووی تەواو:

لە ئەو نیشانەدا، كە تا ئێستا بڵاوكراونەتەوە، ئێمە گوتوومانە ڕەگێشەی نیشانەی (وو) لە كاری (بوونی ئێستایی)دایە. بە واتایەكی دی، ڕێژەی ڕابردووی (بـوون) كە بریتیە لە (بـوو) دەنگی /بـ/ی فڕێ داوە و دەنگی /وو/ ماوەتەوە. واتە، دەنگی /وو/ بریتیە لە نیشانەی ڕابردوو لە ڕابردووی (بـوون)دا. بۆ ڕاڤەكردنی ئەم خاڵە ئاڵۆز و نامۆیە، ڕوو دەكەین لە ڕێژەی (ڕابردووی تەواو) لە (بوون)، وەك:

| | |
|---|---|
| من بوو : (و)م: | من بوو (گـ)ـم |
| تۆ بوو : (و)یت: | تۆ بوو (گـ)ـیت |
| ئەو بوو : (و) ە: | ئەو بوو (گـ)ـە |
| ئێمە بوو : (و)ین: | ئێمە بوو (گـ)ـین |
| ئێوەوە بوو : (و)ن: | ئێوە بوو (گـ)ـن |
| ئەوان بوو : (و)ن: | ئەوان بوو (گـ)ـن |

لە ڕاستیدا، دەنگی /گ/ كە دەچێتە جێی دەنگی نیمچە بزوێنی /وو/، نیشانەی ڕابردووی تەواو پتەو دەبێت و دەشێت كەڵكێكی باش ببەخشێت بە دۆزینەوەی ڕەگێشەی نیشانەی ڕابردوو /وو/. ئەمە و ئەگەر شەش ڕستەی ڕابردووی تەواو ڕیز بكەین، پردی پەیوەندی دەدۆزینەوە، وەك:

من چوو (و) م ← من چوو (گ)ـەم

تۆ چوو (و) یت ← تۆ چوو (گ)ـیت

ئەو چوو (و) ە ← ئەو چوو (گ)ـە

ئێمە چوو (و) ین ← ئێمە چوو (گ)ـین

ئێوە چوو (و) ن ← ئێوە چوو (گ)ـن

ئەوان چوو (و) ن ← ئەوان چوو (گ)ـن

كەواتە، نیشانەی ڕابردووی تەواو, (و) یان (گ), لە گەڵ جێناوەكاندا و لە گەڵ مۆرفیمی ئێستایی (ـە) پەریونەتە سەر قەدی (چوو).

## ٨/٦: بەرەنجام و پوختەكاری:

- پێنج نیشانەكەی ڕابردوو, لە ڕووی وشەسازیەوە, دابەش دەبن بە سەر دوو جۆردا، وەك نیشانە بەبڕشتەكان, وەك (ا) و (د) و نیشانە بێ بڕشتەكان, وەك (ت, وو, ی). بە كۆی گشتی, نیشانەی ڕابردوو (ا) لە بە بڕشتترینە.
- ئەو جۆرەی بێ بڕشتن (ت، وو، ی) ژمارەیان دیاریكراوە و تەنها هەر لە سەر چاوگی بنجی دەردەكەون.
- نیشانەی ڕابردوو (د) بە بڕشتە و بێجگە لە چاوگە بنجیەكان, لە دوو ڕێچكەی ترەوە بڕشتی هەیە، وەك:

(١): گشت كارە تێنەپەڕەكان چاوگی (ئاندن) پەسەند دەكەن و ژمارەی ئەو كارانە بە گشتی دەچێتە سەر ژمارەی چاوگە بنجیە دالیەكان.

(٢): چاوگی (ئاندن) بریتیە لە (وشە ڕۆنەر)ێكی والا و بەكار لە ئاستی دەنگە سروشتیەكاندا و بە ژمارەی ئەو دەنگە سروشتیانە ژمارەی چاوگە دالیەكان پتر دەكات.

- نیشانەی رابردوو (ا)، سەرەڕای چاوگی بنجی، سەرپاکی چاوگی (بکەرنادیار) دادەپۆشێت، بەنەم چەشنە:

(١): گشت چاوگە بنجیە تێپەڕەکان دەبن بە (بکەر نادیار).

(٢): گشت چاوگە بنجییە تێنەپەڕەکان دەبن بە چاوگی (ئانـدن) و لە پاشتردا دەبن بە چاوگی (بکەر نادیار).

(٣): کەواتە، دەبێت گشت کاری زمانەکە، چی تێپەڕ و چی تێنەپەڕ، یان گشت نیشانەکانی رابردوو (ا، د، ت، وو، ی)، لە دیوی (بکەرنادیار)دا ببنەوە بە کاری (ئەلفی)ی تێنەپەڕ[٢٠].

- نیشانەی رابردووی دوور بریتیە لە (بوو). ئەم نیشانەیە روخسارێکی پتەو و نەگۆڕی لە رێژەی رابردووی دووردا.
- لە رووی رێنووسەوە، مۆرفیمی (...بوو) بەندە و دەبێت گشت کاتێک بەراستەوخۆیی نووسابێت بە کلکی ئەو نیشانەی رابردوەوە، کە دەکەوێتە پێشی.
- لە هەر رێژەیەکی رابردووی دووردا، دەرناژبنینی قەدی کارەکە، دەبێت بە هۆی بە جێمانی رێژەی رابردوو لە کاری بوونی ئێستایی.
- رابردووی دووری تێپەڕ هەمان نیشانەی (بوو) وەردەگرێت، بەڵام جیاوازی لە (جێناو)دا دەردەکەوێت، چونکە جێناوەکان لە گەڵ جێناوی رێژەی (بوون) رێك دەکەوون.

---

[٢٠] بۆ نموونە، ئەگەر ژمارەی گریمانەیی چاوگە بنجیەکان بریتی بێت لە (٢٠٠٠ کار)، یان (١٠٠٠ تێنەپەڕ و ١٠٠٠ تێپەڕ)، ئەوا لە ئاستی چاوگی (ئاندن)دا، ئەو (١٠٠٠) کارە تێنەپەڕە دەبنەوە بە (١٠٠٠) کاری (دالی)ی تێپەڕ. یان، لە ئاستی چاوگی (بکەر نادیار)دا، هەر (٢٠٠٠) کارە تێپەڕەکە دەبن بە (ئەلفی). بە کۆی ئامارێکی گشتی ژمارەی کارەکان دەبن بە (٥٠٠٠)، کە (٢٠٠٠)یان تێپەڕە و (٢٠٠٠)یان تێنەپەڕە. بێگومان ئەو ژمارانە هەر بۆ نموونە بەکار هێنراون، بۆ ئەوەی مەودای برشتی نیشانەی دالی و ئەلفی پیشان بدەین.

- نیشانەی رابردووی تەواو بریتیە لە (وو). ئەم نیشانەیە نیمچەبزوێنە و لە پاش (بزوێن) دەبێت (نەبزوێن) و بە یەك واو (و) دەنووسرێت. یان، لە پاش (نەبزوێن) دەبێت بە (بزوێن) و بە دوو واو (وو) دەنووسرێت.
- لە ئاستی ئەو كارانەدا، كە چاوگی (واوی)یان هەیە، نیشانەی رابردووی تەواو ئالۆزییەكی گەورە پیشان دەدات، تەنانەت دێنووسەكەیش كورت دەهێنێت لە ئاستیدا.
- نیشانەی رابردووی تەواو و نیشانەی رابردووی دوور (هاوجێ)ن و یەك خانەیان هەیە، كە بریتیە لە (- ٤) لە پلیكانەی رستەدا. ئەو خانەیەش بە راستەوخۆیی دەكەوێتە پاش خانەی نیشانەكانی رابردوو (ا، د، ت، وو، ی)، كە بریتیە لە (-٣).
- نیشانەی رابردووی تەواو (وو) و نیشانەی رابردووی دوور (بوو) بەهیچ جۆرێك پێكەوە لەسەر یەك (كار) كۆنابنەوە، چونكە ستوونین و لەیەك خانەی رێزمانیدان، كە بریتیە لە خانەی (- ٤).
- بەبێ خانەی (- ٣)، خانەی (- ٤) هیچ كەڵكێكی نیە لە بەكارهێناندا، چونكە پشتبەستە پێی و بەبێ ئەو خانەیە دەرناكەوێت لە رستەی زمانەكەدا.

# بابەتی حەفتەم

## پێشكاری (بـ) لە تەرازووی زمانی نووسیندا[٢١]

### ١/٧: دەسپێك:

لـە زمـانی نووسـیندا، لـە ئاسـتی پێشـكاری بـەردەوامی (بـ)، گـەلێك پـەرپووتی و نارێكی هەیە. بـۆ نموونـە، لـە هەنـدێك جێـدا، بـە خنجی و بەسـفتی ڕێنـووس دەكرێـت و دەردەكـەوێت، كەچـی لـە زۆر جێـی تـردا ون دەكرێـت و لـە ڕیزەكـەدا دەرناكـەوێت. لـە ڕاستیدا، ڕێزمانی ئەم كەرەستە ڕێزمانیە نـەختێك ئـاڵۆزی تێـدا هەیـە، بـەڵام دەتوانرێـت دەسـتەمۆ بكرێـت و بخرێتـە نێـو چێوەكەی خـۆی. لـە ئـەم نووسـینەدا، تـێ دەكۆشـین تـا بتوانین ئەو جێگا ڕێزمانیانە دیاری بكەین, كە پێشكاری (بـ)ی تێدا دەردەكەوێت و ئـەمجا لەهـەر جێگەیەكـدا شـلۆڤەی دەكەینـەوە و دەی خەینـە بـەر لێكۆڵینـەوە. بـۆ نموونـە، پێشكاری (بـ) بۆی هەیە لە دەمكاتی ڕانەبردوودا دەربكەوێت، وەك (ڕەنگە بـڕۆم)، یـان لـە فەرمانی ڕاستەوخۆدا، وەك (تۆ بڕۆ)، یان لە دەمكاتی ڕابردوودا، وەك (با ئـەو بڕۆیشـتبا). لەگەڵ گشت ئەوانـەدا، هەنـدێك جار پێشـكاری (بــ) دەبێـت بـە هێمـای (پێومنووسـی) بـۆ دارشـتنی (نـاوی بكـەر)، وەك (بگـۆڕ). لـە ئـەم هـەل و مەرجـەدا, ڕەگـەزی (بــ)، ئـەوە دەردەخات كە بنجی كاری (گۆڕین) سەربەخۆ نیە و دەبێـت بلكێت بە وشەیەكی ترەوە، تـا ئەو لابچێت، وەك (خۆگۆڕ، داگۆڕ، پێگۆڕ، جلگـۆڕ، ...). لـە ئـەم وشـانەدا، دانـانی پێشـكاری (بــ) دەبێـت بـە نارێزمـان، چـونكە بەشـێوەیەكی كـاتی بـەكارهێنراوە، تـا وشـەیەكی تـر جێگەكەی پڕ دەكاتەوە.

[٢١] گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (١٣٨)، هەولێر ٢٠٠٨

## ٢/٧: خانەی پێشكاری بەردەوامی (بـ):

لە ئیشەكانی ئێمەدا، ئێمە خانەی [+١] تەرخان كراوە بۆ پێشكاری [دە], كە بە پێشكاری بەردەوامی ناسراوە. ئەم كەرەستەیە بۆی هەیە لە هەندێك هەل و مەرجدا بگۆڕدرێت بە (بـ)، وەك:

بێگومان، من [دە] ڕۆم

ڕستەی گومان:

ڕەنگە، من (بـ)ـڕۆم

ڕستەی نیاز:

با، من (بـ)ـڕۆم

ئەمە و خانەی [+١] تەرخان كراوە بۆ پێشكاری بەردەوامی [دە] و [بـ]. ئەم خانەیە دەكەوێتە پێش بنجی كار بە ڕاستەوخۆیی و هیچ گەردیلەیەكی ڕێزمانی بۆی نیە بترنجێتە نێوان ئەو پێشكارە و بنجی كارەكە, مەگەر جێناوی جیگۆڕ و ئامرازی (یش). لەلایەكی تریشەوە، خانەی پێشكاری بەردەوامی هاوسنوورە لەگەڵ خانەی [+٢] كە بەخانەی (نەرێ) ناسراوە. ئەوەی سەیرە، لەنێوان ئەو دووخانەیەدا, واتە [+١] و [+٢], سیمای ئاوێتەبوون هەیە, چونكە نیشانەی (نە) نەیارە لە گەڵ بارگەی خانەی (+١), كە بریتیە لە (دە) یان (بـ), چونكە دەیان توێنێتەوە لە خۆیدا و ڕوخسارێكی سێیەم دەر دەخات، وەك:

- لە ڕانەبردوودا دەگوترێت:

من [دە] ڕۆم

- كەچی، لەدیوی نەرێدا ناگوترێت:

من [نە] [دە] ڕۆم*

- لەبەرانبەردا، دەگوترێت:

من [نا] ڕۆم

كەواتە، روخساری [دە] تواوەتـەوە لـە روخساری [نـە]دا و لـە ئەنجامـدا روخساری سـێیەم [نا] دەركەوتوە، وەك:

[نە] + [دە] ← [نا]

بۆ زانین، ئەم ئاوێتە بوونە سیمای (تێكتواوەیی)ی دەبەخشێت بـە زمانەكـەمان، نەك سیما (پێوە نووسی)، كە لە رابردووی بەردەوامدا دەردەكەوێت، وەك:

- لە ئەرێدا:

من [دە] رۆیشتم

- لە نەرێدا:

من [نە] [دە] رۆیشتم

بە ئاشكرا دیـارە كـە ئـەو دوو كەرەسـتەیە، (نـە) و (دە)، پێكـەوە نووسـاون، نـەك پێكەوە (ئاوێتەكراو) لـە یـەك فـۆرمی دەنگیـدا. كەواتـە، تـەنها لـە رابـردووی بەردەوامـدا، نیشـانەی نـەرێ (نـە) ناتوانێـت پێشـكاری (دە) هـەرس بكـات، بـەلام لـە گشـت جێیەكـدا پێشكاری (بـ) لادەبات، تەنانەت لە رابردووی بەردەوامیشدا.

## ٣/٧: نزرگەكانی پێشكاری (بـ):

پێشكاری بەردەوامی (بـ) بۆی هەیە لە ئەم رووبەرانەدا دەر بكەوێت:

**یەكەم:** دەمكاتی رانەبردوو بە گشتی، وەك:

ڕەنگە (بـ) رۆم

با (بـ) رۆم

**دووەم:** رێژەی فەرمانی راستەوخۆ، وەك:

تۆ (بـ) ڕۆ

تۆ (بـ) خەوە

ئێوە (بـ) ڕۆن

ئێوە (بـ) خەون

**سێیەم:** دەمكاتی رابردووی بەردەوام، وەك:

با شیلان (بـ) رۆیشتبا

**چوارەم:** لەئەو وشانەدا، كە لە رێزمانی كارەوە دارێژراون، وەك (ناوی بكەری رانەبردوو):

بكەر، ببەر، بدەر، بگۆڕ، بگر، بخۆر، ...

ئەم وشانەیش بۆیان هەیە كە پێشكاری (بـ) فرێ بدەن، ئەگەر بكرێن بە (نەری):

نەكەر, نەبەر, نەدەر, نەگۆڕ, نەگر, نەخۆر, ...

یان، ئەگەر لە گەڵ (بەركار)دا جووتكران، وەك:

ئیشكەر: نانبەر: ناندەر: ئاوگۆڕ: دەستگر: نانخۆر

لە ئەم چوار ڕووبەرە بترازێت، پێشكاری (بـ) بڕشتی نیە و ئەگەر هەی بێت ئەوا، یان لێی تێ نەگەیشتووین، یان دەستەواژەكە بە هەڵە دەركەوتوە.

### ٤/٧: كێشەكانی پێشكاری (بـ):

لە كۆپلەی ڕابردوودا، چوار (بەكار هێنان) دیاری كران لە بۆ پێشكاری (بـ) و لە ئەو چوار جێگەیەدا، نموونەی بۆ ڕیز كرا. واتە، هێڵێكی سوور نیگار كرا بە دەوری ئەو ڕووبەرانەدا كە پێشكاری (بـ) هەڵ دەگرن بە ڕێزمان. سەبارەت بە خانەی ڕێزمانی، لە گشت ئەو بەكارهێنانەدا، پێشكاری (بـ) لە خانەی [+١]دا دادەنیشێت و ڕاستەوخۆ دەكەوێتە پێش ڕەگی (كار) و كلكەكەی دەخشێت لە نووكی ئەو كارە، وەك:

ڕەنگە (بـ) خەوم

با (بـ) خەوێت

تۆ (بـ) خەوە

بەهەمان شێوە، لە ناوی بكەریشدا، هەر دەخشێت لە نووكی كارەكە، وەك:

(بـ) گۆڕ

(بـ) بەر

رەنگە بـ (یان) خەوێنم

با بـ (ی) خەوێنێت

تۆ بـ (مان) خەوێنە

لەگەڵ ئەوەیشدا، چەند سەرنجێكی ورد و كاریگەر هەیە لەسەر ئەو كێشانەی كە ئـەم دوو رەگەزە رێزمانیە بەرپایان دەكەن، وەك:

**یەكەم:** كێشەی ئامرازی (یش)، هەردوو كاری (تێپەڕ) و (تێنەپەڕ) دەگرێتەوە.

**دوەم:** كێشەی جێگۆڕكێی جێناوی لكاو تەنهاو تەنها هەر كاری (تێپەڕ) دەگرێتەوە.

**سێیەم:** بە كۆی خاڵی یەكەم و دوەم، دەشێت لە كاری (تێپەڕ)دا هەر دوو رەگەزی (یش) و (جێناوی لكاوی جێگۆڕ) پێكەوە بترنجێنە نێوان پێشكاری (بـ) و رەگی كاردكە، وەك:

رەنگە بـ (یش) (یان) نێرم

بەواتایەكی دی، كلكی پێشكاری (بـ) سەربەخۆ نیە و گشت كاتێك لكاوە بە نـووكی كـارەوە. لەگـەڵ ئەوەیشـدا، هەنـدێك رەگـەزی رێزمـانی هەیـە، كـە دەتوانێـت خـۆی بترنجێنێتـە نێوانیان و لەیەكتری جودایان بكاتەوە، وەك:

**یەكەم:** ئامرازی (یش)، وەك:

ڕەنگە بـ (یش) خەوم

با بـ (یش) خەوێت

تۆ بـ (یش) خەوە

بەداخەوە، لە ئاخاوتنی كوردیدا، دیاردەی جێگۆڕكێی جێناو زاڵكراوە بە سەر ئەم كەرەستەیەدا، ئەگەرنا، دەبا لە دواوەی ڕستەدا جێگیر بكرێت.

دووەم: دیاردەی جێگۆڕكێی جێناوی لكاو، وەك:

یان،

ڕەنگە بـ (یان) (یش) نێرم

بێگومان، ئامرازی (یش) پەرپووتیەكی زۆری خستوەتە نێو ڕیزەكەوە، چی بە (جێگۆڕكی) و چی بە ناڕێكی لە ڕیزبووندا. سەرەڕای ئەوانەیش، لەڕووی دەنگسازی و لەڕووی ڕێنووسەوە، كێشەی هەیە.

چوارەم: ئەو كێشانەی كە لە خاڵەكانی سەرەوەدا باس كران، بەهیچ جۆرێك (ناوی بكەر) ناگرنەوە، چونكە لە چالاكی ڕستازیانەدا نیە.

٥/٧: لەگەڵ پێشكاری (نەرێ):

وەك لەپێشتردا باس كرا، پێشكاری (بـ) چوار بەكارهێنانی هەیە و ئەو بەكارهێنانەیش هەر هەموویان لە ڕێزمانی كاردان. لە ڕووی ڕیزبەندیەوە، ئەو ڕاستیە دیاری كرا كە پێشكاری (بـ) لە كلكەوە دەلكێت بە نووكی كارەوە، چونكە لەخانەی [+١]دا دادەنیشێت. ئەوەش لەیاد نەكەین كە پێشكاری (بـ) لە جەمسەری نووكەوە دەلكێت

بەكلكی خانەی [+٢]ەوە، كە نیشانەی نەرێ (نە)ی تێدایە و ئەم ڕەگەزە دەبێت بە هۆی بەرپابوونی كێشە لە هەرچوار بەكارهێنانەكەدا، وەك:

**یەكەم:** لە دەمكاتی ڕانەبردوودا، پێشكاری (بـ) دەناڵێت بە پێشكاری (نە)وە و گۆكراوێكی دوو تووخم لە چەشنی (نە)، پەیدا دەبێت، وەك:

ڕەنگە (نە) (بـ)ـڕۆم* : ڕەنگە (نە)ڕۆم

**دووەم:** لە فەرمانی ڕاستەوخۆدا، پێشكاری (بـ) دەناڵێت بە پێشكاری نەرێ (نە)وەو گۆكراوێكی دوو توخم لە چەشنی (مە) پەیدا دەبێت، وەك:

تۆ (نە) (بـ) خەوە : تۆ (مە) خەوە

**سێیەم:** لە دەمكاتی ڕابردووی بەردەوامدا، پێشكاری (بـ) دەناڵێت بەنیشانەی نەرێ (نە)وە و گۆكراوێكی دوو توخم لە چەشنی (نە) پەیدا دەبێت، وەك:

با شیلان (نە) (بـ) خەوتبا : با شیلان (نە) خەوتبا

**چوارەم:** وەك لەپێشتردا باسكرا، ناوی بكەر، وەك (بگۆڕ)، لە بۆی هەیە كە نیشانەی نەرێ (نە) وەربگرێت، وەك:

(بـ) گۆڕ : (نە) گۆڕ

لە گشت ئەو بەكارهێنانەدا، بە باندۆری نیشانەی نەرێ (نە)، پێشكاری (بـ) ئاودیو بوە و لە ریزەكەدا نەماوە، بەلاّم هەندێك بە جیاوازیەوە، وەك:

**یەكەم:** لەخالّی یەكەم و دوەم و سێیەمدا، دەشێت پێشكاری (بـ) بپارێزین، ئەگەر پێشكارێكی تر بەكار بهێنین، وەك:

رەنگە من (دا) (بـ) نیشم

تۆ (دا) (بـ) نیشە

با (دا) (بـ) نیشتبا

**دوەم:** لە (ناوی بكەر)دا، باری پێچەوانە دەچەسپێت، چونكە ناتوانین پێشكاری (بـ) بپارێزین، ئەگەر پێشكارێكی تر بەكارهێنرا، وەك:

دا (ـ) گۆڕ، نەك (دابگۆڕ)

پێ (ـ) گۆڕ، نەك (پێ بگۆڕ)

جل (ـ) گۆڕ، نەك (جل بگۆڕ)

### ٦/٧: پێشكاری (بـ) لە ناوی بكەردا:

لە كۆپلەكانی پێشوودا، بابەتی (ناوی بكەر) كەوتە بەر لێكدانەوە و خوردكردنەوە، بەلاّم هەندێك باری تایبەتی و ئالّۆز هەرمایەوە، وەك:

**یەكەم:** ئامرازی ناوی بكەر (ەر) بۆی هەیە كە پێشكاری (بـ) لاببات، وەك:

بگۆڕ + (ەر) ← (-) گۆڕەر

یان، وشەیەكی تر كە لە ڕێزمانی كاری (گۆڕین)دا پەسەند بێت، بۆی هەیە لای ببات، وەك:

دا + بگۆڕ ← داگۆڕ

دووەم؛ لە هەندێك (كار)دا كە بنجەكەیا زۆر كورتە وەك (كردن، بردن، دان)، پێشكاری (بـ) دەتوانێت لەگەڵ ئامرازی ناوی بكەر (ەر) ئامادەبێت، وەك:

(بـ) (كە) (ەر)

(بـ) (بە) (ەر)

لە ئەم وشانەدا، هەر پێشكارێك دەتوانێت پێشكاری (بـ) لاببات، كەچی ئامرازی (ەر) نەی توانیوە لای ببات، وەك:

ڕۆ + (بكەر) ← ڕۆكەر

دەر + (ببەر) ← دەربەر

كەواتە، لە كونجێكی زۆر هورد و دانسقەدا، پێشكاری (بـ) توانیوەتی خۆی بگونجێنێت لە گەڵ ڕەگەزی ناوی بكەر (ەر).

## ٧/٧: بەرەنجام و پوختەكاری:

- پێشكاری (بـ) لە پەرێزی ڕێزمانی كاردایە و ئەگەر بە (ناو)ێكەوە دیار بێت، ئەوا ئەو ناوە لە پەرێزی كارەوە دارێژراوە.
- پێشكاری (بـ) لە كلكەوە دەلكێت بە نووكی كارەوە.
- پێشكاری (بـ) لە نووكەوە دەلكێت بە كلكی نیشانەی نەرێ (نە)وە.
- سروشتی ئەو لكانەی كە لەنێوان پێشكاری (بـ) و (ڕەگی كار)دا پەیدا دەبێت لە جۆری (پێوەنووسی)یە، بەڵام ئەوەی نێوان پێشكاری (بـ) و نیشانەی نەرێ (نە) لە ئەو جۆرە نیە، چونكە دیاردەی (ئاوێتە بوون) چێ دەبێت لە نێوانیاندا.
- پێشكاری (بـ) بۆی هەیە لە چەند ڕووبەرێكی زمانەكەدا دەربكەوێت، وەك:

**یەكەم:** لەرستەی نیازدا، وەك (با بڕۆم)، یان لە رستەی گوماندا، وەك (ڕەنگە بڕۆم).

**دوەم:** لە رستەی (نیاز)دا و لە ڕابردوودا، وەك: (با ئەو بڕۆیشتبا).

**سێیەم:** لە فەرمانی ڕاستەوخۆدا، وەك (تۆ برۆ).

**چوارەم:** لە (ناوی بكەر)دا، وەك: (بخۆر، ببەر، بگۆڕ ....).

- لەئەو بەكارهێنانەدا، پێشكاری (بـ) لەگەڵ نیشانەی نەرێ (نە) ئاوێتە دەبێت و بە ڕوخساری (نە) دەمێنێتەوە، بەڵام لە فەرمانی ڕاستەوخۆدا بە ڕوخساری (مە) دەمێنێتەوە. كەواتە، جیاوازیەكی بنچینەیی لە ڕەگێشەی فەرمانی ڕاستەوخۆدا هەیە.
- لە (ناوی بكەر)دا، پێ دەچێت كە پێشكاری (بـ) هێما بێت بۆ (جێلك)، واتە ئەو جێیەی كە بۆشە و دەبێت پڕ بكرێتەوە، وەك نیشانەی تەقەڵ (ـ) كە دەخرێتە پێش جێناوی لكاو ( ـ م، ـ ت، ـ ی، ـ مان، ـ تان، ـ یان).
- لە گشت جێیەكدا، ڕەگەزی (ناوی بكەر)، كە بریتیە لە (ەر)، پێشكاری (بـ) لادەبات، بەڵام لە كونجێكی زۆر هوردو بەرتەسكدا، پێشكاری (بـ) بۆی هەیە كە

خۆی بپارێزێت و لەگەڵ ئامرازی (مر) خۆی بنوێنێت لەیەك وشەدا، وەك (ببـەر، بدەر، بخەر، ببەر، ...).

- لە ڕێنووسی زمانی كوردیدا، پێشكاری (بـ) زۆر پەرپووتكراوە و بـە هەڕەمـەكی و بەبێ ئاگایی دەكەوێتە بەر پێنووسی نووسەران. واتە، بەتێكەڵ و پێكەڵی تۆماری دەكەن، لەوانەیە، لە جێیەكدا تۆمـاری بكـەن و لەجێیـەكی تـردا تۆمـاری نەكـەن، هەر چەند هەردوو نموونەكە (هاورێزمان)بن.
- لە گشت نووسینەكانی خۆماندا، ئێمـە, بـە دەسـتی مەبەسـت, نـەمان هێشتوە كـە پێشكاری (بـ) تۆمار نەكرێت، مەگەر بە (ڕێزمان).

وەك بەرەنجامێكی پێشـكەوتوو (ئـەیلوول ٢٠١٦), پـێ دەچێت كـە نیشانەی نـەرێ (نە) دوژمنی سەرسەختی پێشكاری (بـ) بێت, چـونكە لـە گشـت جێیەكـدا دەی خواتـەوە و هەرسی دەكات بە ڕێزمان. لە ئەم ڕوانگەیەوە, ڕەنگە نیشانەی نـەرێ (نـە) لـە ڕەگێشـەوە توخمی پێشكاری (بـ)ی هەڵ گرتبێت و پێویستی پێ نەبێت. تەنانەت, لە نـاوی بكەریشـدا لای دەبات, وەك (بگۆڕ : نەگۆڕ), كە هـیچ پەیوەنـدیـەكی بـە ژینگـەی ڕستەسـازیەوە, وەك سێ بەكارهێنانەكەی تر.

## سەرچاوە:


- د. شێركۆ بابان، ڕستەسازی و شیتەڵكاری زانستی، هەولێر ١٩٩٦.
- د. ئـەورەحمانی حـاجی مـارف، زمـانی كـوردی و خـەوشـی هەنـدێ وشـەو زاراوەی نوێ، بەشی یەكەم، بەغدا ٢٠٠٠.

# بابەتی هەشتەم

# چەند بابەتێكی ڕێزمانی بە بەراورد[٣٢]

**٨/١: دەسپێك:**

ئەو كەسەی كە لە كرۆكی ڕێزمانی كوردیدا هەنگاوی توێژینەوە بكاتەوە، دەچێتە نێو چەندین بەزم و ڕەزمی سەیر و سەمەرەوە، چونكە زۆر چڕ و پتەوە و ئاوەها بە سووك و ئاسان گەمەی بلیمەتانەی تێدا ناكرێت. لە ئەم ڕووەوە، زانیاری ڕێزمانی زمانانی دیكە وەك (عەرەبی، ئینگلیزی، فەرەنسی) بەشی ڕێزمانی كوردی ناكات و هەموو هوردە كێشەكان داناپۆشێت و چارەسەریان ناكات. بۆ نموونە، لە چ زمانێكدا, لە ئەو سێ زمانە، (جێگۆڕكێی جێناوی لكاو) هەیە. یان, كێشەی (دەنگە نیمچەبزوێن) وا بە چڕی هەیە. یان, دەركەوتەكەكانی (سیستمی ئێرگەیتیف) هەن. لە ئەم نووسینەدا، دەرگای بەروارد دەكەینەوە، بۆ ئەوەی ڕێزمانی كوردی هاوسەنگ و پارسەنگ بكەین لە تەرازووی زمانی ئینگلیزیدا و هەندێك لە ئەو كەلكانە بخەینەڕوو كە دەشێت ڕێزمانی كوردی بە ڕێزمانی زمانی ئینگلیزی ببەخشێت. ئەمە و لە ئاستی دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی)دا، ڕێزمانی كوردی پەیامی خۆی هەیە، چونكە ڕێزمانەكەی زۆر پتەوترە و مەودای گەمەكەی زۆر ئاڵۆز و بەربلاوترە. لە بەشەكانی داهاتوودا، چوار بابەتی ڕێزمانی دەخەینە ڕوو و لە ئەو چوار بابەتەدا سروشتی زمانەكە شلۆڤە دەكەینەوە، چونكە ڕێزمانی كوردی ماكی ڕەسەن و مۆركی جوانی خۆی هەیە و ئەو ماك و مۆركانە جودای دەكەنەوە لە زمانانی دیكە. بە هیوایین بتوانین خزمەتێكی بچووك پێشكەش بكەین، چی بە ڕێزمانی كوردی و چی بە ئەو خوێنەرە ئازیزانەی كە حەز دەكەن هەنگاوی گەمەی ڕێزمانی بەراوردكاری بكەنەوە لە زمانەكەدا.

---

[٣٢] گۆڤاری (پەروەردە و فێر كردن), ژمارە (٤), هەولێر ٢٠٠٩.

**۲/۸: ڕێزمانی ئینگلیزی و ڕێزمانی كوردی:**

لە ڕێزمانی زمانی ئنگلیزیدا، نیشانەی نەناسراوی (a)، دیوێكی دیكەی هەیە، لە چەشنی (an)، وەك: (a boy) (an egg). لە راستیدا, چەند نارێكیەك و چەند پەرپووتیەك هەن لە بەكارهێنانی ئەم نیشانەیەدا, وەك:

**یەكەم:** نیشانەی (a) بە سەرەكی دادەنرێت و نیشانەی (an) بە دیوێكی لاوەكی لە ئەم نیشانەیە.

**دوەم:** نیشانەی (an) بۆ ئەو وشانە بەكار دەهێنرێت، كە بە (ڤاوڵ) دەست پێدەكەن، كەچی هەندێك جار لە ئەو وشانەدا بەكاردەهێنرێت كە بە (كۆنسۆنت) دەست پێدەكەن، وەك: (an hotel).

**سێیەم:** نیشانەی (a) لە هەندێك وشەدا بەكاردەهێنرێت كە بە (بزوێن) دەست پێدەكەن، وەك: (a union), (a usual ...), (a Europien country).

بێگومان نارێكی و پەرپووتی دیارە بە بەكارهێنانی هەردوو دیوی كەرەستەكەوە و منداڵی بەستەزمان و زۆر هیلاك دەبن بە دەست ئەو نارێكیە رووكەشیانەوە. تەنانەت, لە هەندێك باردا بە لە بەركردن (دەرخكردن) و دووبارەبوونەوە فێری دەبن، نەك بە ڕێزمانێكی پڕ بە پێست. لە ڕێزمانی كوردیدا، هەمان پەرپووتی پەرپوەتەوە و بوە بە نەخۆشیەك و چوەتە نێو بیری مامۆستایانی زمانانی دیكەوە. واتە، لە هەر جێیەكدا پەتی ڕێزمانەكە بپچڕێت گرێی دەدەنەوە و ناوی دەنێن (نارێكی ڕێزمانی) و كێشەكە لە جێی خۆیدا بە نامۆیی و بە نارەوایی پینە دەكەن، بەلأم بە پینەیەكی ناجۆر و ناقۆلاً. لە تیۆری (زەبری بزوێن)دا, كە ئێمە دامانناوە، كێشەی هەردوو نیشانەی (a, an)و هاوشێوەكانیان بە چەشنێك چارەسەركراوە كە یەكلایی ببێتەوە، بە ئەم چەشنە:

**یەكەم:** نیشانەی رەسەنی نەناسراوی بریتیە لە (an) و دەنگی /n/ بوە بە دەنگێكی خپ لە پاش بزوێنی /a/. ئەو دەنگە لە بیردانی ژێریدا خەزنكراوە و روخساری نیشانەی (an) هەر بە رواڵەت بوە بە /a/.

**دووەم:** دەنگی خپی /n/ بە هیچ شێوەیەك دەرناكەوێت مەگەر لە ژێر (زەبری بزوێن)دا. واتە ئەگەر سەری بزوێنێك بخشێت لە كلكی دەنگی /n/، ئەوا ئەو دەنگە دەبووژێتەوە بۆ (ناوگرایەتی) و بەس. واتە، هەر كاتێك كە سەری بزوێنەكە لاچوو، ئەوا دەنگی /n/ دەگەڕێتەوە بۆ باری خپی خۆی لە كتێبخانەی بیردا.

**سێیەم:** ناوەڕۆكی خاڵی یەكەم و دووەم بە تەواوی و بە زەقی بە ڕێزمانی زمانی فەرەنسیەوە دیارە، چونكە بۆ هەمان بابەت، وەك (un) بۆ (نێر) و (une) بۆ (مێ) ڕێنووس دەكرێت.

**چوارەم:** ئەگەر خاڵی یەكەم و دووەم بكرێت بە مەحەك، ئەوا دەتوانین هێڵێكی سوور بكێشین لە نێوان ئەو وشانەدا كە بە (نەبزوێن) دەست پێ دەكەن و نیشانەكە دەكەن بە (a) و ئەو وشانەی كە بە (بزوێن) دەست پێدەكەن و نیشانەكە دەكەن بە (an).

**پێنجەم:** وەك نموونە، لە وشەی (egg)دا سەرەتای وشەكە ڤاولە وەك (ێ)و سەری ئەو ڤاولە دەنگی خپی /n/ی ڕاكێشاوە و بووە بە: (ئە: نێگ) : (a-negg). بە پێچەوانەوە، لە وشەی (eurpean)، سەرەتای وشەكە نەبزوێنە (هەمزە)، وەك (ئیروپیەن) و پێویست نابێت كە دەنگی /n/ زیندوو ببێتەوە، وەك: (ئەئیروپیەن...)، یان (a eurpean). یان، لە وشەی (hotel)دا، دەنگی /h/ زیادەیە و وشەكە بە ڤاول دەستپێدەكات، وەك: (ۆتێل)، كە بووە بە (an hotel)، یان (ئەنۆتێل).

**٢/٨: ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی بە بەراورد:**

لە زمانی كوردیدا، ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی نەختێك جودایە لە ڕێزمانی هەمان بابەت لە زمانانی دیكەدا. بۆ نموونە، لە زمانی ئینگلیزیدا دیاردەی (دوو بەركاری) گراوە بە بابەت و دەگوترێت كاری (give) دوو (بەركار) وەردەگرێت، وەك: (Sheelan gave me an apple، بە واتای: (شیلان سێوێكی دا بە من). واتە، جێناوی (me) بە نهێنی ئامرازێكی پەیوەندی هەڵگرتووە لە زمانی كوردیدا بەرانبەربە (پێم) یان (بە من) دەوەستێت، كەواتە، جێناوی (me) دوو ڕەگەزە، چونكە بریتیە لە ئامرازێكی پەیوەندی

(بە) و لە جێناوێك (من). لە نموونەیەكی دیكەدا, وەك: (Seelan saw me), بە واتای (شیلان منی بینی), جێناوی (me) سادەیە و یەك ڕەگەزە و ئاڵۆدە نەبوە بە ئامرازێكی پەیوەندیەوە. هەر لەبەر ئەو هۆیە، دەشێت هەردوو جۆرەكەی جێناوی (me) لە یەكتری جودا بكرێنەوە، لە جیاتی ئەوەی بگوترێت: (هەندێك كار دوو بەركار وەردەگرن). لەلایەكی دیكەوە، لە زمانانی دیكەدا، زۆر جار ئامرازی پەیوەندی دەتوێتەوە لە (ئاوەڵكار)دا, وەك: (لە پاش: after), یان (لە پێش: before). لە ئەم نموونانەدا, پەرێزە ڕێزمانیەكە بە هوردی و بە ئاشكرایی دەگەڕێتەوە بۆ ئامرازی پەیوەندی (لە) و ئەو ئامرازە (ئاوەڵكار)ی وەك بارگە وەرگرتوە. هەر بۆ نموونە, ئامرازی پەیوەندی (لە) ئاوەڵكاری (پاش)ی وەرگرتوە و دەستەواژەیەكی لێكدراوی چێكردوە، وەك (لەپاش). لە بانیژەی ڕێزمانی كوردیەوە، ئەگەر سەیری دەستەواژەی (لەپاش) بكەین دەتوانین چەند سەرنجێك تۆمار بكەین, وەك:

**یەكەم**: ئامرازی (لە..) بە پوختی و بە پاكی بریتیە لە ئامرازێكی پەیوەندی.

**دوەم**: ئاوەڵكاری (پاش) بریتیە لە ئاوەڵكارێكی روون و پەتی.

**سێیەم**: بەپێی خاڵی پێشوو, ئاوەڵكاری لێكدراو (لەپاش) بریتیە لە ئاوەڵكارێكی لێكدراو, بەڵام هەردوو پێكهاتەكەی زۆر زۆر زوڵاڵ و ئاشكران.

**چوارەم**: بەراورد لەگەڵ زمانی ئینگلیزیدا، وشەی (after) دوو ڕەگەزی تێدا هەیە، بەڵام بە تێكتواوەیی و بە ئاڵۆزی. لە زمانی عەرەبیدا وشەی (بعد) واتای (لە پاش) دەبەخشێت، بەڵام بە ئاڵۆزی. لە زمانی فەرەنسیدا وشەی (après) هەمان واتا دەبەخشێت، بەڵام هەر بە ئاڵۆزی.

**پێنجەم**: ئەگەر لە زمانی كوردیدا، هورد ببینەوە لە وشەكانی (لەژێر، لەبن، لەپاش، لەپێش، لەتەنیشت، لەسەر, لەگەڵ, لەتەك, ...), دەبینین كە پەرێزی ئامرازێكی پەیوەندی (لە...) بە تەواوی روون و ئاشكرایە و پەرێزی ئاوەڵكارەكانیش هەر ئاشكرایە. بە واتایەكی تر, وشەی (ژێر، پاش، تەنیشت، سەر، ناو...) برتیین لە ئاوەڵكاری سادە و پەتی.

كەواتە, لە زمانی كوردیدا پەرێزی ئامرازێكی پەیوەندی ناوێتە نەبوە بە پەرێزی ناوەڵكارو هەردوو پەرێزەكە (پێكەوەنووساو)ن، بەڵام (تێكتواوە) نین.

**٤/٨: دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی[٢٢]):**

لە زمانی كوردیدا, دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی) بارێكی چالاك و دینامیكی دەنوێنێت، واتە ئەگەر ڕەگەزێكی ڕێزمانی بریتی بێت لە یەك نیمچە بزوێن، ئەوا ئەو دەنگە بۆی هەیە, بە پێی ژینگەكەی, ڕاوێشكە بكات لە نێوان دیوی بزوێن ( Vocalic phase)و دیوی نەبزوێندا (Consonantal phase). هەر بۆ پرۆفە, لە چەند جێیەكدا دیاردەی نیمچەبزوێنایەتی دەردەكەوێت وەك:

١- ئامرازی بەستن (ی) لە نێوان (ناو) و (ناوەڵناو)دا, وەك: (پەنجەرەی نزم) و (دیواری نزم). لە نموونەی یەكەمدا، ئامرازەكە بە (نەبزوێن) و لە نموونەی دوەمدا بە (بزوێن) دەركەوتوە.

٢- ئامرازی بەستن (ی) لە نێوان دوو (ناو)دا, وەك: (دەرگای باخ) و (دیواری باخ). لە نێرەیشدا هەمان سەرنجی خاڵی پێشوو هەیە.

٣- لە جێناوی كەسی یەكەمی كۆدا (ین): وەك (ئێمە ڕۆیشتایین) و (ئێمە ڕاوەستاین). لە نێرەیشدا, هەمان سەرنجی خاڵی (١) دووبارە دەبێتەوە و دەنگی /یـ/ جاری یەكەم بە (نەبزوێن) و جاری دوەم بە (نەبزوێن) دەركەوتوە.

٤- لە جێناوی خاوەنیەتیشدا, هەمان دیاردە هەیە, وەك: (مامی شیلان: مامی) و (خاڵۆی شیلان: خاڵۆی).

٥- ئەمە و لە ڕێزمانی كوردیدا, نموونە زۆرە بۆ ئەوەی كە نیمچە بزوێنی (ی) یان (وو) هەر جارەی بە جۆرێك دەربكەون لە هەمان هەڵومەرجی ڕێزمانیدا, بەڵام ئەوە گرنگە كە بارێكی تر بدۆزینەوە بۆ ئەوەی دیاردەی نیمچەبزوێنایەتی بە جوانی

---

[٢٢] بۆ زانیاری پتر لە سەر ئەم بابەتە, بڕوانە بۆ بابەتی هەشتەم لە كتێبی (دەنگسازی زمانی كوردی بە تیۆری زەبری بزوێن), هەولێر ٢٠١٤.

دەربخەین، وەك: جێناوی لكاو (ی) لە ڕستەسازیدا. لە ڕاستیدا, جێناوی لكاوی (ی) بۆی هەیە چەندین جار ڕاوێشكە بكات و بگۆڕێت لە (بزوێن)ەوە بۆ (نەبزوێن), یان بە پێچەوانەوە, وەك: (شیلان ناردی). لە ئەم نموونەیەدا, جێناوی (ی) بزوێنە و ئەگەر ڕستەكەین بكەین بە (ڕابردووی بەردەوام), یان بە (نەرێ) ئەوا دەگۆڕێت بە (نەبزوێن), وەك: (شیلان دەی نارد), (شیلان نەی نارد). ئەمجار، ئەگەر كاری (ناردن) بكەین بە (هەڵگرتن), ئەوا جارێكی تر دەبێتەوە بە (بزوێن) وەك: (شیلان هەڵی گرت). یان, ئەگەر لە جیاتی پێشگری (هەڵ) پێشگری (دا) بە كار بهێنین, ئەوا جارێكی دیكە دەبێتەوە بە (نەبزوێن), وەك: (شیلان دای گرت). بێگومان, ئەم گەمەیە دوور و درێژە و لە هەر جێیەكدا كە نیمچە بزوێنی (ی) بخشێت لە (كلكی نەبزوێن)، ئەوا دەگۆڕێت بە دیوی بزوێندا. ئەوەیش لەیاد نەكەین كە ئەم جۆرە گەمەیە زۆر زۆر ئاساییە و گشت كەسێك لێی تێ دەگات. ڕەنگە ڕەخنەمان لێ بگرن و بڵێین: ئەم تشتانە زانراون، بێگومان گەمەكە هەر ئەوەندە نیە، چونكە چەند ڕوونكردنەوەیەك هەیە, وەك:

**یەكەم:** لە ئەو زمانەدا كە لێی شارەزاین، نموونەی ئەم جۆرە گەمەیە زۆر زۆر كەمە و بە ئەو قەبارەیە نیە كە لە ئەلبومی زمانی كوردیدا هەیە.

**دووەم:** وەك لە ئەو زمانانەدا, گەمەكە وا گەورە نیە، هەر ئەوهایش بایەخ بە ڕێزمانەكەی نەدراوە، چونكە پێویستی پێ نەبوە. لە زمانی كوردیدا, بابەتەكە جیاوازە و بەرفراوانە و دەتوانرێت بخرێتە سەر كاغەز و ڕێسای بۆ دابڕێژرێت. لە ئەم ڕووەوە, زمانانی دیكە دەتوانن كەڵك لە ڕێزمانی كوردی وەربگرن.

**سێیەم:** ئەو كێشەیە لە زمانانی دیكەدا هەیە, بەڵام بە كەرەستەی زمانی كوردی زۆر جوانتر شرۆڤە دەكرێت. بێگومان, تێگەیشتن لە سروشت و میكانیزمی نیمچە بزوێنی (ی)و نیمچە بزوێنی (وو) بریتیە لە تێگەیشتن لە بابەتی فۆنۆلۆژی زمانەكان, بەڵام بە پێداچوونەوەیەكی سەرتاسەریەوە.

### ٥/٨: ئامرازی بەستن (و) بە بەراورد[٢٤]:

لە زمانی كوردیدا, بۆ ئەوەی دوو كەرەستە پێكەوە بەكار بهێنرێن, واوی بەستن بەكار دەهێنرێت, وەك: (ژن و پیاو : كوڕ و كچ : شاخ و داخ : دار و بەرد). هەمان ئامرازی بەستن (و) بەكار دەهێنرێت لە زمانی عەرەبی و فارسیدا، بەلام بەشێوەیەكی زۆر جیاواز, بە ئەم چەشنە:

**یەكەم:** لە زمانی كوردیدا, ئەم ئامرازە لە یەك دەنگی (بزوێن) پێكهاتوە و ئەو دەنگەیش بریتیە لە (واو)ی بزوێن, وەك: (دار و بەرد). بە ئاشكرا دیارە، كە ئامرازی بەستن (و) لە یەك دەنگی بزوێن پێكهاتوە و ئەو دەنگە بزوێنەیش لە نووكەوە خشاوە لە دەنگی /ر/ لە وشەی (دار)دا و بڕگەیەكی دروست كردوە لە چەشنی (رو).

**دووەم:** لە زمانی عەرەبیدا، واوی بەستن بڕگەیەكی ساغی هەیە، چونكە لە دوو دەنگ پێكهاتوە و بە دوو فۆنیم گۆ دەكرێت. فۆنیمی یەكەم واوی نەبزوێنە و فۆنیمی دووەم بزوێنە. هەر لەبەرئەو هۆیە، لە زمانی عەرەبیدا ئەو فۆنیمەی كە بە (واوی بەستن) ناسراوە بە بڕگەی (وە) گۆ دەكرێت. وەك: (شیلان وە شیرین). بە خوێندنەوەی كوردی، ئەو دەستەواژەیە بە ئەم چەشنە دەخوێنرێتەوە: (شیلا نو شیرین). لە زمانی فارسیدا، چونكە وەك زمانی عەرەبی واوی بەستن بە بڕگەی ساغی (وە) گۆ دەكرێت.

**سێیەم:** بە پێی ئەوەی گوترا، لە زمانی كوردیدا دەشێت واوی بەستن بە كلكی وشەی بەراییەوە بلكێت. كەواتە, لە بانیژەی ئەم ئامرازەوە، زمانی كوردی جودا دەبێتەوە، لە زمانی عەرەبی و فارسی.

**چوارەم:** لە زمانی كوردیدا، ئامرازی بەستن (و) لە یەك بزوێن پێكهاتوە و ئەو بزوێنەیش بریتیە لە (نیمچە بزوێن). هەر لەبەرئەوە, گشت كاتێك لە ژێر ركێفی دوو میكانیزمدایە، وەك:

[٢٤] هەمان پەراوێزی پێشوو.

(١): لە بەرئەوەی لە یەك (بزوێن) پێكهاتوە و یەك (بزوێن)یش بڕگەیەكی ناتەواو پێك دەهێنێت، گشت كاتێك دەبێت بلكێت بە ئەو بزوێنەوە كە دەكەوێتە پێشی، وەك: (شاخ|و|داخ : شا|خو|داخ)

(٢): لە بەرئەوەی بزوێنی (و) بریتیە لە (نیمچەبزوێن)، لە پاش دەنگی (بزوێن) بە دیوی (نەبزوێن)دا دەگۆڕێت، وەك: (ما|مۆسـ|تا|و| قوتابی : ما|مۆسـ|تاو| قوتابی).

**پێنجەم**: بە پێی ئەو خاڵانەی سەرەوە، واوی بەستن لە زمانی كوردیدا بریتیە لە یەك نیمچە بزوێنی سرك و لە ئەو زمانانەی دیكەدا، بریتیە لە بڕگەیەك لە چەشنی (وە). خۆزگە لە زمانی كوردیشدا واوی بەستن پتەو دەكراو دەخرایە نێو چێوەی بڕگەیەكی تەواو. لە ئاستی رێنووسیشدا، جودا دەكرایەوە لە هەردوو بڕگەكەی لە هەردوو لاوە، وەك چۆن وشەی (and) لە زمانی ئینگلیزیدا و وشەی (et) لە زمانی فەرەنسیدا، بە جودایی رێنووس دەكرێن. واتە, لە دەقی نووسیندا دوو (كەلێن) دەخرێتە پێش و پاشی وشەكە و جودا دەكرێتەوە لە هەردوو جەمسەری هەردوو وشە هاوسنوورەكەی.

### ٦/٨: بەرەنجام و پوختەكاری:

- لە زمانی ئنگلیزیدا, دەشێت رێسای رێزمانی نیشانەی نەناسراوی (a) بە چەشنێك دابنرێت، وەك: {**روخساری رەسەنی ئامرازەكە بریتیە لە (an) و دەنگی /n/ خپ بوە، ئەو دەنگە كاتێك زیندوو دەبێتەوە كە بخشێت لە سەری (بزوێن)ێك**}.
- لە رێزمانی كوردیدا, پەرێزی ئامرازی پەیوەندی زۆر روونە و نەتواوەتەوە بە بابەتی دیكەدا. هەر بۆ نموونە, ئامرازی پەیوەندی بە ئاسانی جودا دەكرێتەوە لە بەركاری ناراستەوخۆ، یان لە ئاوەڵكار. بە راستی, ئەم جۆرە شیكارە لە ئاستە بالاكانی توێژینەوەسازیدا زۆر پێویستن.
- بە پوختی, دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی) لە زمانی كوردیدا زۆر زۆر بلاو و فرەنموونەیە و دەشێت ئەلبووم و ئەتڵەسی بۆ چێ بكرێت، بۆ ئەوەی كەڵك

ببەخشێت بە زمانانی دیكە. لە زمانانی دیكەدا كێڵگەی نیمچەبزوێن هێندە بە كەڵك و بە بەرهەمكەت نیە, وەك هی زمانی كوردی. بە راستی, دوان لە سێ بزوێنە سووچـزمانیەكانی دەنگسازی (/ا/, /ی/, /وو/) بـریتین لـە (نیمچـەبزوێن) و دەبێت بایەخ بدرێت بە جۆرە بابەتی وا كوور و كرۆكی. هەر بۆ ئەوەیە كە ئێمە بایەخمان پێداوە.

- ئامرازی بەستن (و) لە زمانی كوردیدا گشت كاتێك كێشەدارە، چونكە لە یەك دەنگی نیمچە بزوێن پێكهاتوە. هەمان ئامراز لە زمانانی دیكەدا بە برگەی (وە) دەنووسرێت. لە زمانی كوردیشدا دەشێت لە ئاستی رێنووسدا پتەو بكرێت و بە وشەی سەربەخۆ بنووسرێت، وەك هی زمانانی دیكە.

**سەرچاوە:**


١- د. شێركۆ بابان، دەنگسازی و برگەسازی، هەولێر، ٢٠٠٦

٢- محمد غريب جودة، الموسوعة الشاملة والمعاصرة في قواعد اللغة الانكليزية، مكتبة ابن سينا، القاهرة، ٢٠٠٥.

3- P. Roach, *English Phonetics and Phonology*, Cambridge University Press, UK 1999.

4- M. Swan and F. Houdart, *Pratique de L'Englais de A a Z*, Hatier, Paris 1983.

## لیستی توێژینەوەكان لە بواری ڕێزمانی كوردیدا

**بۆزانین:**

لە ئەم ساڵانەی دواییدا ( لە ٢٠٠٨ بە ئەملاوە), زۆربەی زۆری ئەو نووسینانەی خوارەوە پێدا چوونەوە و نۆژەنكردنەوەیان بۆ كراوە و ئەمجا پۆلێكراون و كراون بە (ڕیزە بابەت) و لە دووتوێی كتێبێكدا بڵاوكراونەتەوە. لە ئەم ڕووەوە, داوا لە خوێنەرانی ئازیز دەكەین كە ئەو نووسینانە لە كتێبەكاندا بخوێننەوە, چونكە تازەكراونەتەوە. بۆ ئاسانكاری, جێگای بڵاوكردنەوەی هەر بابەتێك دیاریكراوە, بۆ نموونە, لە سەر بابەتی (٢٢) نووسراوە: (كتێبی ٤/١٢), واتە ئەم نووسینە كراوە بە بابەتی (٤) و لە كتێبی ژمارە (١٢)دا بڵاكراوەتەوە, كە بریتیە لە (زمانی نووسینی ڕێزماندار) لە لیستی كتێبەكانی نووسەردا. تەنانەت, بابەتەكانی ئەم كتێبەی بەردەستیش (كتێبی ٤٢) دیاریكراون.

١- جێ گۆڕكێی جێناوی لكاو، ڕۆڵی بكەر و بەركار، گۆڤاری كاروان ژمارە (٢)، ١٩٩٢. كتێبی ١/٣٦

٢- بڵاوكردنەوەی پوختەی پرۆژەی:
Programmable Grammar of the Kurdish Language
لە بڵاوكراوەكانی زانكۆی ئەمستردام، پەیمانگای مەنتیق و زمان و كۆمپیوتەر، ژمارە (Lp-95-02)

٣- دەنگی خپ لە زمانی كوردیدا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١١٦)، هەولێر ١٩٩٧. كتێبی ٢٢/ ١

٤- ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٢٠)، هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ١/٢٣

٥- بڕشتی خانە ڕێزمانیە بۆشەكان لە نێو بیردا,گۆڤاری (پەیامی مامۆستا), ژمارە (٩)، هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ١/٤٢

٦- ڕەگەزە ڕێزمانیە ستوونیەكان, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١١٨), هەولێر ١٩٩٨.

٧- لێكدانەوەی رستە بە ژمارە, گۆڤاری (نووسەری نوی)، ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ٢/٤٢

٨- پێنج پێشنیار بۆ زمانی رۆژنامەگەری، گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٢٠)، هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ١/١٢

٩- چێوەی برگەی دەنگسازی, گۆڤاری (مەتین), ژمارە (٧٦), دهۆك ١٩٩٨. كتێبی ٢/٣٢

١٠- جێناوی نادیار, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٣), هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ٢/٣٦

١١- كۆلكە رێزمانیە دوو رەگەزەكان, گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) , ژمارە (١٠), هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ٣/٤٢

١٢- كێشەی كاری (هاویشتن) لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری (مەتین), ژمارە (٧٨), دهۆك ١٩٩٨. كتێبی ٢/١٢

١٣- ئامرازی پەیوەندی (ە) ، لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری كاروان, ژمارە (١٢٢)، هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ٢/١٢

١٤- خشتەی لێكدانی بزوێن ,گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٢٤)، هەولێر ١٩٩٨.

١٥- شێوەزاری گەرمیان بەبەراورد , گۆڤاری (هاواری كەركووك), ژمارە (١), هەولێر ١٩٩٨.

١٦- پانۆرامای مۆرفیمی ئێستایی (ـە),گۆڤاری (پەیامی مامۆستا), ژمارە (١١), هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ٢/٣٢

١٧- كێشەی روخساری جێناو, گۆڤاری (رواندز) , ژمارە (٢), هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ٣٦/ ٢

١٨- بەرەو زمانی نووسین: مەكینەی وشە رۆنان, گۆڤاری (رامان) , ژمارە (٢٨), هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ١/١٣

١٩- میكانیزمی وەرچەرخان, گۆڤاری (مەتین) , ژمارە (٨١), دهۆك ١٩٩٨. كتێبی ٣٦/ ٤

٢٠- میكانیزم لە بزاڤی جێگۆركێدا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٢٧)، هەولێر ١٩٩٨.

٢١- چەند نهێنیەك لە رێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)دا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٦), هەولێر ١٩٩٨. كتێبی ٢/٣٣

٢٢- كێشەی جێناوی كەسی دووەمی تاك لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری (مەتین) , ژمارە

(٨٣), دهۆك ١٩٩٨. كتێبی ٤/١٢

٢٣- ڕێزمانی پاشكۆی (یەتی), گۆڤاری (پەیڤ) , ژمارە (٩), دهۆك ١٩٩٨. كتێبی ٤/٣٣

٢٤- كێشە و كەڵك لە ڕێزمانی كەسی سێیەمی تاكدا, گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) , ژمارە (١٢), هەولێر ١٩٩٨, ژمارە (١٣), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٤/٤٢

٢٥- بڕگەی دووبارە لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری (مەتین), ژمارە (٨٧), دهۆك ١٩٩٩. كتێبی ٥/١٢

٢٦- ڕێزمانەكە خۆی خۆی ڕاست دەكاتەوە, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٩), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٣/٣٢

٢٧- نەخشەی دابەشبوون لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا, گۆڤاری (هەڵەبجە), ژمارە (١), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ١/٣٨

٢٨- میكانیزمی زەبری بزوێن, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٣٢), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٤/٣٢

٢٩- دوو ڕەگەزی ڕێزمانی بە بەراورد, گۆڤاری (هەڵەبجە), ژمارە (٢), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٥/٣٢

٣٠- ڕێژەی فەرمان, گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) , ژمارە (١٤), هەولێر ١٩٩٩.

٣١- پاشگری دووپات كردنەوە (ەوە) لە شیتەڵكاریدا, گۆڤاری (مەتین) , ژمارە (٩٠), دهۆك ١٩٩٩. كتێبی ٤٠/ ١٠

٣٢- گەمەیەك لە گەڵ ئامرازی (ی)دا, ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر, ژمارە (١٤٠), هەولێر ١٩٩٩/٨/٢٠. كتێبی ٣٩/ ٢

٣٣- دەنگی كپ و دەنگی نیمچە كپ لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (١٠), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٦/٣٢

٣٤- گەشتێك لە گەڵ جێناوی كەسی سێیەمدا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٣٦), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٤٢/ ٥

٣٥- جێناوی لكاو بە بەراورد, گۆڤاری (ڕامان), ژمارە (٣٩), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٥/٣٦.

٣٦- تایبەتمەندێتی لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا, گۆڤاری (بیاڤ), ژمارە (٢), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٢/٣٨

٣٧- ئامرازی بار و سەربار " ی", گۆڤاری (پەیامی مامۆستا) , ژمارە (١٥), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ١/٣٩

٣٨- لە ئەلبوومی خلیسكەبزوێندا, گۆڤاری (پەیف) , ژمارە (١٢), دهۆك ١٩٩٩. كتێبی ٧/٣٢

٣٩- جەبر و ڕێزمانی كوردی, ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر, ژمارە (١٤٨), هەولێر ١٩٩٩/١٠/١٥ كتێبی ٦/٤٢

٤٠- واتاسازی لە پاشگری ( ەوە)دا, گۆڤاری ( ڕۆشنبیری كوردستانی), ژمارە (١), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٤٠/ ١١

٤١- لە پەراوێزی مۆرفیمی ئێستاییدا, گۆڤاری (هەڵەبجە), ژمارە (٣), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٥/٣٣

٤٢- گرێی دەنگسازی, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٣٩), هەولێر ١٩٩٩ كتێبی ١٠/٤١

٤٣- ڕێزمانی ئامرازی گەیێنەر, ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر, ژمارە ( ١٥٧ ), هەولێر ١٩٩٩. كتێبی ٣/٣٩

٤٤- ئامرازی ئاماژە و ئامرازی گەیێنەر, گۆڤاری (مەتین) , ژمارە (٩٥), دهۆك ١٩٩٩. كتێبی ٤/٣٩

٤٥- ئامرازی ناساندن (ەكە)، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٦)، هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ٧/٤٢

٤٦- پلەی پۆلە جێناوەكان، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٤٢)، هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ٧/٣٦

٤٧- گەشتێك بە ناو واتای كاری سووتاندا, گۆڤاری ( ڕۆشنبیری كوردستانی), ژمارە (٢), هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ٨/٤٢

٤٨- گەمەیەك لەناو ئامرازەكانی ناساندندا, ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر, ژمارە (١٧٣), هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ٦/٣٩

٤٩- روخسارەكانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) , گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (١٣),
هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ٦/٣٣

٥٠- گەمەیەك لە گەڵ مۆرفیمی بۆشدا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٤٤)، هەولێر ٢٠٠٠
كتێبی ٣/١٣

٥١- بنجایەتی لە هێزی تێپەڕیندا, ڕێزمانی بنەڕەت, گۆڤاری (رامان) ژمارە ( ٤٧),
هەولێر ٢٠٠٠.

٥٢- گەمەیەك لەگەڵ ئامرازی ئاماژەدا, گۆڤاری (پەیامی مامۆستا), ژمارە (١٧),
هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ٥/٣٩

٥٣- دۆخەكانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە), گۆڤاری (مەتین), ژمارە (١٠١), دهۆك٢٠٠٠.
كتێبی ٧/٣٣

٥٤- جێناوی سادە و جێناوی ناسادە, گۆڤاری (رامان), ژمارە (٥٠), هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی
٩/٤٢

٥٥- تایبەتمەندی لە جێناوی كەسی سێیەم دا, رۆژنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر, ژمارە
(١٩٠), هەولێر ٨/١٨/ ٢٠٠٠. كتێبی ٦/٣٦

٥٦- ڕێژەی نائاشكرا لە نیازداری و گوماندارییدا, گۆڤاری كاروان, ژمارە (١٤٨), هەولێر ٢٠٠٠.

٥٧- نموونەیەك لە چاكسازی لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (١٨)،
هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ٦/١٢

٥٨- بەرەو ڕێزمانی بڕگە , گۆڤاری ( رۆشنبیری كوردستانی), ژمارە (٢), هەولێر ٢٠٠٠.
كتێبی ١١/٤١

٥٩- دەنگی /ت/ لە روخساری جێناودا بە بەڵگە، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٥٢)، هەولێر
٢٠٠٠. كتێبی ٣٦/ ٨

٦٠- چەند نهێنییەك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی(ـە)دا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٥٢)،
هەولێر ٢٠٠٠. كتێبی ١٥/ ١١

٦١- ڕێژەی بكەر نادیار و چەند سەرنجێك، گۆڤاری(رامان)، ژمارە(٥٥)، هەولێر ٢٠٠٠.

٦٢- ئامرازی پەیوەندی (بۆ) لە چەند سەرنجێكدا، ڕۆژنامەی (برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (٢١٦)، هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ٨/١٥

٦٣- ڕامانێك لەئاستی ناوی واتایی لە زمانی نووسیندا، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٥٧)،، هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ٧/١٢

٦٤- سێ میكانیزم بۆ دەركەوتنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٠٩)، دهۆك ٢٠٠١. كتێبی ٨/٣٣

٦٥- گەمەیەك لە نێو برگەی دەنگسازیدا، گۆڤاری (پەیامی مامۆستا)، ژمارە (٢٠)، هەولێر ٢٠٠١.

٦٦- گەشتێك لە ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندیدا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٥٥), هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ٢/١٥

٦٧- ڕێزمانی كەرەستەی (هەر) بەلێكدراوی, گۆڤاری (یەكبوون), ژمارە (١٧), هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ١٢/٣٩

٦٨- كەرەستەی (هەر) لە شرۆڤەكاری ڕێزمانیدا, گۆڤاری (ڕامان), ژمارە (٥٩), هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ٣٩/ ١٣

٦٩- ئامرازی پەیوەندی لە ئاوەڵگوزارەدا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٥٧) , هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ٣/١٥

٧٠- ڕامانێك لە ئاستی خوێندنی ڕێزمان لە قوتابخانەكاندا, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٧), هەولێر ٢٠٠١.

٧١- نابووت كردنی ئامرازی پەیوەندی لە زمانی ڕۆژنامەگەریدا, گۆڤاری (ڕۆژنامەوانی), ژمارە (٥), هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ٨/١٢

٧٢- ئامرازی پەیوەندی (لە), گۆڤاری (كاروان), ژمارە (١٦٠), هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ٤/١٥

٧٣- گەشتێك لە نێو ڕێزمانی ئاوەڵناودا, گۆڤاری (ڕامان), ژمارە (٦٣-٦٤), هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ١/٢٤

٧٤- كەڵكی ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە وانەی ڕێزماندا, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی),

ژمارە (١٠)، هەولێر ٢٠٠١. كتێبی ١٢/١٥

٧٥- واتای گشتی، واتای تایبەتی، واتای خوازراو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠١.

٧٦- ئامرازی پەیوەندی (بۆ) لەشرۆڤەكاری ڕێزمانیدا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٦٢)، هەولێر ٢٠٠٢. كتێبی ٩/١٥

٧٧- زمانی ڕۆژنامەگەری و هەڵسووڕاندنی هەواڵ، گۆڤاری (ڕرۆژنامەگەری)، ژمارە (٩)، هەولێر ٢٠٠٢. كتێبی ٩/١٢

٧٨- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (بە) ، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (١٢٦)، دهۆك ٢٠٠٢. كتێبی ٦/١٥

٧٩- كێشەی ڕێنووسی واوی درێژ، گۆڤاری ( رامان)، ژمارە (٧٩)، هەولێر ٢٠٠٣. كتێبی ٨/٣٢

٨٠- مۆرفیمی ئێستایی لە ژێر جێناودا، بە بەڵگە، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٨١)، هەولێر ٢٠٠٣. كتێبی ١/٤٠

٨١- روخساری مۆرفیمی ئێستایی بە بەڵگە، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٢١)، هەولێر ٢٠٠٤. كتێبی ٤٠/ ٢

٨٢- ئامرازی بەستن (ی) لە چەند گەمەیەكی شرۆڤەكاریدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٨٦\٨٧)، هەولێر ٢٠٠٤. كتێبی ٧/٣٩

٨٣- چەند ئەندازەیەك بۆ ناسینەوەی ئاوەڵناو، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٢٣)، هەولێر ٢٠٠٤. كتێبی ٣٩/ ٨

٨٤- پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی ، گۆڤاری (ئەكادیمی)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٤ كتێبی ١/١٥

٨٥- ئاوەڵناو وەك كوانوویەك بۆ ناوی واتایی، گۆڤاری (پەیڤ)، ژمارە (٣١)، دهۆك ٢٠٠٤ كتێبی ٢/٢٤

٨٦- بەڵگەسازی و ئەندازەكاری لە ئاكارەكانی ئاوەڵناودا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٩٢)، هەولێر ٢٠٠٥ ، كتێبی ٣/٢٤

٨٧- كاری (كردن) بریتیە لە دیوە تێپەڕەكەی (بوونی ڕووداودار)، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٩٣)، هەولێر ٢٠٠٥ كتێبی ٢/٣٧

٨٨- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی كاری (هەبوون)دا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٩٥)، هەولێر ٢٠٠٥. كتێبی ٣/٣٨

٨٩- لە ئاكارە ڕەنگینەكانی ڕێزمانی كوردی، گۆڤاری (مێرگ)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٥.

٩٠- بوونی بێ ڕووداو بوونی ڕووداواداربە بەراورد، گۆڤاری (ئەكادیمی)، ژمارە (٣)، هەولێر ٢٠٠٥ كتێبی ٤/٣٨

٩١- حەشارگەی دەمكاتی ئایندە لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٩٧)، هەولێر ٢٠٠٥. كتێبی ٥/٣٨

٩٢- ڕێزمانی كاری (كردن) بۆ مامۆستایانی زمانی كوردی، گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٥٨)، هەولێر ٢٠٠٥. كتێبی ٣/٣٧

٩٣- جۆرەكانی (بوون) لە ژێر میكرۆسكۆپی لێكۆڵینەوەدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (١٠٢)، هەولێر ٢٠٠٥. كتێبی ٦/٣٨

٩٤- تایبەتمەندی لە ڕەفتاری ئامرازی كۆ (ان)دا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٩٩)، هەولێر ٢٠٠٥. كتێبی ٤/٢٤

٩٥- بزوێنی بزرۆكە /i/ بە بەرجەستەیی لە ڕێنووسدا، گۆڤاری (هزرین)، ژمارە (٢)، هەولێر ٢٠٠٥. كتێبی ١/٤٣

٩٦- پەندی (ڕەگ بە ڕەگێشە و گلێخە بە بنە تۆو ) لە تەرازووی زماندا، گۆڤاری (ئاسۆی فۆلكلۆر)، ژمارە (١٦)، هەولێر ٢٠٠٦.

٩٧-ڕێچكەكانی ڕستەسازی لە كاری بوونی ئێستایی دا، گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (٢٠٢)، هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٣٨/ ٧

٩٨- وشە ڕۆنان بە بێ ئامرازی ڕێزمانی ، گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣١)، هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٢/١٣

٩٩- گەمەیەكی هورد و ئالۆز لە ڕێزمانی بوون و هەبووندا, گۆڤاری (رامان), ژمارە (١٠٧), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٣٨/ ٨

١٠٠- چەند سەرنجێك دەربارەی كاری بێهێز و كاری ناتەواو, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٦٤), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٣٨/ ١٠

١٠١- گەشتێك بە ناو ڕێزمانی ئامرازی (نەرێ)دا , گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٣٢), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٢/٤٣

١٠٢- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی چاوگی (ئاندن)دا , گۆڤاری (پەیڤ), ژمارە (٣٧),دهۆك ٢٠٠٦.

١٠٣- واتادانەوەی كاری (شكان) لە ئاخاوتنی كوردەواریدا, گۆڤاری (ئاسۆی فۆلكلۆر), ژمارە (١٨), هەولێر ٢٠٠٦.

١٠٤- چەند وێستگەیەك لە ڕێزمانی ناوەڵناودا , گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٠٥), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٥/٢٤

١٠٥- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی كاری (دان)دا , گۆڤاری (ئەكادیمی), ژمارە (٤), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٤/٣٧

١٠٦- بوونی ئێستایی و مۆرفیمی ئێستایی بریتین لە كار بە بەڵگە و بە شرۆڤە, گۆڤاری (رامان), ژمارە (١٠٧), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٣٨/ ٩

١٠٧- سێتی ڕێزمانی وەك كەرەستەیەك بۆ فێركردن لە وانەی ڕێزماندا, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٦٧), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٦/٣٧

١٠٨- پاشگری ناوی بكەر (ـەر) لە شرۆڤەكاریدا , گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٠٨), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٥/١٣

١٠٩- گرنگی وشەی (خۆ) لە ڕێزماندا, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٦٩), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٣/٤٣

١١٠- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە سێتی ڕێزمانیدا , گۆڤاری ( نووسەری نوێ), ژمارە (٣٤), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ٤٠/ ٢

١١١- ئەرك و ریزی ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی كاردا, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٧٢), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ١٥/١٣

١١٢- ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی كاری (هاتن)دا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٣٥), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ١٥/١٤

١١٣- ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی كاری (كەوتن)دا, گۆڤاری (پەیامی مامۆستا), ژمارە (٣٠), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ١٥/١٥

١١٤- گرنگی (بەركار) لە ئاستی ڕێزمانی كار و ڕێزمانی چاوگدا, گۆڤاری (رامان), ژمارە (١١٦), هەولێر ٢٠٠٦. كتێبی ١٣/٨

١١٥- پۆلینكردنی تەرزسازییانەی زمانی كوردی, گۆڤاری (ئەكادیمی), ژمارە (٥), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ٤٣/٤

١١٦- ئامرازی (ـە) وەك ئامرازێكی پتەو لە ڕێزماندا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢١٣), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١٥/١٦

١١٧- ڕێزمانی پاشگری (ـەر) بە نموونە و بە شرۆڤە, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٧٥\٧٦), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١٣/٨

١١٨- ئامرازی (بۆ) و ئامرازی (لەبۆ) بە شرۆڤە و بە بەراورد, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢١٦), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١٥/١٠

١١٩- دیوە تیۆرییەكانی ڕێزمانی بەركاری ڕاستەوخۆ, گۆڤاری (ئەكادیمی), ژمارە (٦), هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٠- ماكەكانی شێوەزاری گەرمیان لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری (نەوشەفەق), ژمارە (٤٣), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١٢/١٠

١٢١- كێشە دەنگسازییەكانی ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی كاردا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٣٧), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١٥/١٦

١٢٢- ئامرازی نیشانە لە چەند ئالۆزییەكی ڕێزمانیدا , گۆڤاری (پەیامی مامۆستا), ژمارە (٣١), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ٣٩/٩

١٢٣- پاشگری ناوی بكەر (ـەر) پاشگری ناوی بەركار (راو) بە شرۆڤەو بە بەراورد, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢١٨), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ٧/١٣

١٢٤- لە سیما جوانەكانی شێوەزاری گەرمیان, گۆڤاری (نەوشەفەق), ژمارە (٤٦), هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٥- كەرەستەی (هی) و كەرەستەی (هین) لە شرۆڤەكاری رێزمانیدا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٣٨), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١٠/٣٩

١٢٦- كاری ( بریتی بوون لە......) لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری (رامان), ژمارە (١٢٥), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١١/١٢

١٢٧- كەرەستەی (تر) لە روانگەی زمانی نووسینەوە, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٢٠), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ٦/٢٤

١٢٨- چەند سەرنجێكی زاراوەسازییانە, گۆڤاری (ئاسۆی فۆلكلۆر), ژمارە (٣٠), هەولێر ٢٠٠٧.

١٢٩- سۆراخێك بە دوای مۆرفیمی ئێستاییدا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٣٩), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ١٠/٤٢

١٣٠- ئاخاوتنی ئزەـوزە لە شرۆڤەكاری زانستیدا , گۆڤاری (ئاسۆی فۆلكلۆر), ژمارە (٣١), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ٤١ /١٢

١٣١- هەندێك تایبەتمەندی دەنگسازییانە لە نیشانەكانی رابردوو (د) و (ت)دا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٢٣), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ٥/٤٣

١٣٢- وشەی ریزمانی و وشەی لێكسیكی, گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی), ژمارە (٧٨), هەولێر ٢٠٠٧. كتێبی ٤/١٣

١٣٣- نیشانەكانی رابردوو و نیشانەكانی جۆری رابردوو, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٤٠), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٦/٤٣

١٣٤- گوڵبژێرێك لە وشە تایبەتییەكانی شێوەزاری هەولێر, گۆڤاری (ئاسۆی فۆلكلۆر), ژمارە (٣٢), هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٥- هەندێك لە لە جۆرەكانی تێپەڕ لە شرۆڤەكاریدا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٢٦), هەولێر ٢٠٠٨.

١٣٦- ڕێساكانی وشەرۆنان لە بنجی كارەوە, گۆڤاری (ئاینده), ژمارە (٧٨), سلێمانی ٢٠٠٨. كتێبی ١٣/١٠

١٣٧- ڕێزمانی ناو و لارێزمانی ئاوەلناو لە تەرازووی بەراورددا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٤١), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٢٤/٧

١٣٨- ئامرازی پەیوەندی "بە" لە چەندین بەكارهێناندا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٢٩), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١٥/٧

١٣٩- كاری ئاراستەدار و كاری ئامرازدار لە زمانی كوردیدا, گۆڤاری (نەوشەفەق), ژمارە (٥٧), هەولێر ٢٠٠٨. لە كتێبی (گەشتێك بە ڕێزمانی كاردا/٢٠١٦) بلاْوكراوەتەوە. كتێبی ٣٧/٧

١٤٠- ئەلبوومێك بۆ نیشانەی كۆ "ان" لە ئاخاوتنی كوردیدا, گۆڤاری (پەروەردە و فێركردن), ژمارە (١), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٤٢/١١

١٤١- كاردەكانی دەنگی سروشتی لە ئاخاوتنی كوردیدا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٤٢), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٣٧/ ٨

١٤٢- ڕێزمانی ڕێژەی تێپەڕ لە شرۆڤەكاریدا, گۆڤاری (نەوشەفەق), ژمارە (٦٠), هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٣- پێشكاری (بـ) لە زمانی نووسیندا, گۆڤاری (رامان), ژمارە (١٣٨), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٤٣/٧

١٤٤- ڕێژەی كاری تێپەڕ لە شرۆڤەكاریدا , گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٣٢), هەولێر ٢٠٠٨.

١٤٥- دوو جێناوی لكاو بە بەراورد (ـیت) و (ـێت), گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٤٣), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٣٦/٩

١٤٦- مۆرفیمی ئێستایی بە ئاوێتەیی, گۆڤاری (نەوشەفەق), ژمارە (٦٢), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٤٠/ ٤

١٤٧- زمانی كوردی زمانێكی بكەرلەپێش, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٠), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١/٢٤

١٤٨- زمانی كوردی زمانێكی بكەربەزێن, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥١), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٢/٢٤

١٤٩- زمانی كوردی زمانێكی ئەركگۆڕ, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٢), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٣/٢٤

١٥٠- زمانی كوردی زمانێكی نووسەكی, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٣), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٤/٢٤

١٥١- زمانی كوردی و جێگۆڕكێی جێناو, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٤), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٥/٢٤

١٥٢- نیشانەی كۆ (ان) تایبەتمەندی خۆی هەیە, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٥), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٦/٢٤

١٥٣- جێناوی كەسی سێیەم توخمی دوور و نزیك هەڵ دەگرێت, زنجیرە زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٧)هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٧/٢٤

١٥٤- جێناوی كەسی سێیەم وەك باتلۆیەكی ڕێزمانی, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٨), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٨/٢٤

١٥٥- ئامرازی گەیەنەر لە سەر ئامرازی نیشانە ڕۆنراوە, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٥٩), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ٩/٢٤

١٥٦- ئامرازی ئاسراوی (ەكە) دیوی كۆی هەیە, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٦٠), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١٠/٢٤

١٥٧- دیاردەی ئەركگۆڕكێی جێناو, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٦١), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١١/٢٤

١٥٨- بووژاندنەوەی دەنگی خپی /ت/, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٦٣), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١٢/٢٤

١٥٩- بووژاندنەوەی دەنگی خپی (ر), زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٦٤), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١٣/٢٤

١٦٠- سێتە جێناوی بارگاوی (م, یت, ـە, ین, ن. ن), زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٦٧),هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١٤/٢٤

١٦١- نیشانەی نەرێ (نی), زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٧٠), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١٥/٢٤

١٦٢- ریزە جێناوی (م, ت, ی, مان, تان, یان) بارگاوین بە بەركارێكی نادیار, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٧٤), هەولێر ٢٠٠٨. كتێبی ١٦/٢٤

١٦٣- سركایەتی لە روخساری رستەدا, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٧٨), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ١٧/٢٤

١٦٤- كێشەی نیشانەی رابردوو /ت/, زنجیرەی زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردكاریدا, گۆڤاری (هەرێمی كوردستان), ژمارە (٤٧٩), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ١٨/٢٤

١٦٥- ئامرازی پەیوەندی (ە) لە چەند ئالۆزییەكی رێزمانیدا, گۆڤاری (پەروەردەو فێركردن), ژمارە (٢), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٤٠/ ٧

١٦٦- كاری بوونی ئێستایی لە پەرێزی رستەسازیدا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٣٦), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ١١/٣٨

١٦٧- پانۆرامایەك بۆ رێزمانی ئاوەڵناو لە ئاخاوتنی كوردیدا, گۆڤاری (ك ٢١ ), ژمارە (٤), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٨/٢٤

١٦٨- پانۆرامایەك بۆ واتاكانی كاری (دان) لە ئاخاوتنی كوردیدا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٤٥), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٥/٣٧

١٦٩- ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە رێزمانی كاری ئاسادەدا, گۆڤاری (زمانناسی), ژمارە (١), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٨/٤٠

١٧٠- چەند پەراوێزێك لە تەرازووی زمانی نووسیندا, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٤٦), هەولێر ٢٠٠٩.

١٧١- رێزمانی ئاوەڵناو بە بەراورد, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٢٨), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ١٢/٤٢

١٧٢- دیوە تیۆرییەكانی فۆنیم و برگەی دەنگسازی لە ئاخاوتنی كوردیدا, گۆڤاری (زمانناسی), ژمارە (٢), هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٣- نیشانەی نەرێ (نی) لە شرۆڤەكاریدا, گۆڤاری (پەروەردە و فێركردن), ژمارە (٢), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٣٢/ ٩

١٧٤- دیوە تیۆرییەكانی گرێی دەنگسازی برگەی ئاخاوتنی كوردی بە نموونە, گۆڤاری (زمانناسی), ژمارە (٣), هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٥- رێزمانی كاری لێكدراو بە كۆلكەی بەركار, گۆڤاری (ك ٢١), ژمارە (٥-٦), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٢/٢٣

١٧٦- جیاوازی نێوان ئامرازی كار و ئامرازی ناوەڵگوزارە, گۆڤاری (نووسەری نوێ), ژمارە (٤٧), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٥/٤٠

١٧٧- شیرازەی كاری ئاسادە, گۆڤاری (زمانناسی), ژمارە (٤-٥), هەولێر ٢٠٠٩ كتێبی ٢/٢٣

١٧٨- رێزمانی بكەر و بەركار لە تەرازووی رێزمانی كاردا, گۆڤاری (كاروان), ژمارە (٢٤٠), هەولێر ٢٠٠٩.

١٧٩- چەند بابەتێكی رێزمانی بە بەراورد, گۆڤاری (پەروەردە و فێر كردن), ژمارە (٤), هەولێر ٢٠٠٩. كتێبی ٨/٤٣

١٨٠- ئامرازی (ـە) لە بەر زوومی پرسیاردا, گۆڤاری (زمانناسی), ژمارە (٦), هەولێر ٢٠١٠.

١٨١- ئاستەكانی جیاوازی لە نێوان رێزمانی كاری دارێژراو و كاری لێكدراودا, گۆڤاری (ك ٢١), ژمارە (٧) هەولێر ٢٠١٠.

١٨٢- تیۆری سەرتاسەری روخساری فۆنیم لە ئاخاوتنی كوردییەوە, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٠), هەولێر ٢٠١١. كتێبی ١/٤١

١٨٣- تیۆری سەرتاسەری گرێی دەنگسازی لە ئاخاوتنی كوردییەوە, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١١), هەولێر ٢٠١١. كتێبی ٢/٤١

١٨٤- تیۆری سەرتاسەری بنیادی بڕگەی ئاسایی, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٢), هەولێر ٢٠١٢. كتێبی ٣/٤١

١٨٥- تیۆری سەرتاسەری بڕگەی لێكدراو, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٣), هەولێر ٢٠١٢. كتێبی ٤/٤١

١٨٦- تیۆری سەرتاسەری بڕگەی ناتەواو, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٤), هەولێر ٢٠١٢. كتێبی ٥/٤١

١٨٧- تیۆری بنیادی بڕگە, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٥), هەولێر ٢٠١٢. كتێبی ٦/٤١

١٨٨- تیۆری زەبری بزوێن لە دەنگسازی زمانەكاندا, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٦), هەولێر ٢٠١٢. كتێبی ٧/٤١

١٨٩ – تیۆری یەكەی كۆنترۆڵی بڕگەیی لە دەنگسازیدا, گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٧), هەولێر ٢٠١٣. كتێبی ٨/٤١

١٩٠ – كتێبی تەمەن (Vowel Power Theory), گۆڤاری (زانكۆ پرێس), ژمارە (١٩), هەولێر ٢٠١٣. كتێبی ٩/٤١

# كتێبە بڵاوكراوەكانی نووسەر

١- ڕستە سازی و شیتەڵكاری زانستی، هەولێر ١٩٩٦

٢- میكانیزمە بنەڕەتیەكانی ڕستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون، هەولێر ١٩٩٧

٣- داینامیزمی جێناوی لكاو لە ڕستەسازیدا, هەولێر ١٩٩٧

٤- نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی كار، هەولێر ١٩٩٩

٥- لە مۆركە ڕەسەنەكانی ڕێزمانی كوردی , هەولێر ٢٠٠٠

٦- بەرەو ڕێزمانی كوردی : بەرەو زمانی نووسین، هەولێر ٢٠٠٠

٧- شرۆڤەكاری ڕێزمانی لە زمانی نووسیندا, هەولێر ٢٠٠٠

٨- ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ـەوە) , هەولێر ٢٠٠١

٩- ڕێزمانی كەسی سێیەمی تاك، هەولێر ٢٠٠٤

١٠- دەنگسازی و بڕگەسازی لە ڕێزمانی كوردیدا, هەولێر ٢٠٠٥

١١- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) , هەولێر ٢٠٠٦

١٢- زمانی نووسینی ڕێزماندار, هەولێر ٢٠٠٨

١٣- بەرەو وشەڕۆنان لە زمانی نووسیندا , هەولێر ٢٠٠٨

١٤- هەندێك لە ئاكارە ڕەنگینەكانی ڕێزمانی كوردی، هەولێر ٢٠٠٨

١٥- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا , هەولێر ٢٠٠٩

١٦- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠٠٩ ( نووسینەوەی یەكەم)

The Phonemic Junction Faculty

١٧- بەرەو زانستی دەنگسازی لە ئاخاوتنی كوردییەوە, سلێمانی ٢٠١٠

١٨- بـە زمـانی ئنگلیـزی، هـەولێر ٢٠١٠, (نووسـینەوەی دووەم, پێداچـوونەوە و نۆژەنكردنەوە)

The Phonemic Junction Faculty, 2nd edition

١٩- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٠

Engineering Phonology

٢٠- سێ میكانیزمی رێزمانی، دەزگای موكریانی، هەولێر ٢٠١٢

٢١- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣

Vowel Power Theory

٢٢- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣

Phonetic Engineering

٢٣- رێزمانی كاری ناسادە، هەولێر ٢٠١٤

٢٤- بەرەو رێزمانی ناوەڵناو, هەولێر ٢٠١٤

٢٥- دەنگسازی زمانی كوردی بە تیۆری زەبری بزوێن، هەولێر ٢٠١٤

٢٦- بنچینەی رێزمانی كوردی، هەولێر ٢٠١٤

٢٧- برگەسازیی كوردی لە تیۆری زەبری بزوێندا, هەولێر ٢٠١٤

٢٨- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٤

Syllabification and Re-syllabification Processes

٢٩- رستەسازی و شیتەڵكاری زانستی/ نووسینەوەی دووەم / هەولێر ٢٠١٥

٣٠ بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٥

Minimized Phonology and Phonetic System Insertion

٣١- رێزمانی بوون و هەبوون لە شرۆڤەكاری زانستیدا/ هەولێر ٢٠١٥

٣٢- بنچینەی دەنگسازی لە زمانی كوردیدا/ هەولێر ٢٠١٥

٣٣- پانۆرامایەك بۆ رێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە), هەولێر ٢٠١٥

٣٤- زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردا, هەولێر ٢٠١٥

٣٥- چەند وانەیەك لە رێزمانی كوردیدا, هەولێر ٢٠١٥

٣٦- پانۆرامایەك بۆ رێزمانی جێناو, هەولێر ٢٠١٥.

٣٧ - گەشتێك بە نێو رێزمانی كاردا, هەولێر ٢٠١٦

٣٨- گەشتێك بە نێو رێزمانی بوون و هەبووندا, هەولێر ٢٠١٦.

٣٩- گەشتێك بە نێو ئامرازەكانی رێزمانی كوردیدا, هەولێر ٢٠١٦

٤٠- سێ مۆركی رێزمانی كوردی, هەولێر ٢٠١٦.

٤١- دەنگسازی زمانی كوردی لە پێشڤەچووندا, هەولێر ٢٠١٦.

٤٢- چەند بابەتێكی ئاوازە لە رێزمانی كوردیدا, هەولێر ٢٠١٦,

٤٣- گەشتێك بە كرۆكی رێزمانی كوردیدا, هەولێر ٢٠١٦. (ئەم كتێبەی بەردەست).

**S = A ≠ O:**

**Accusative System**

| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|
| بکەر = (S) | بەرکار = (O) : بکەر = (A) |
| من دە خەو (م) | من دە (ی) نووس (م) |
| تۆ دە خەو (یت) | تۆ دە (م) نووس (یت) |
| ئەو دە خەو (ێت) | ئەو دە (ت) نووس (ێت) |
| ئێمە دە خەو (ین) | ئێمە دە (یان) نووس (ین) |
| ئێوە دە خەو (ن) | ئێوە دە (مان) نووس (ن) |
| ئەوان دە خەو (ن) | ئەوان دە (تان) نووس (ن) |

نەخشەی (٣/٤): سیستمی (ئەکیووزەیتیڤ) لە رانەبردوودا.

**S = O ≠ A:**

**Ergative System**

| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|
| بکەر = (S) | بکەر = (A) : بەرکار = (O) |
| من دە خەوت (م) | من دە (م) نووسی (ی) |
| تۆ دە خەوت (یت) | تۆ دە (ت) نووسی (م) |
| ئەو دە خەوت (ێت) | ئەو دە (ی) نووسی (یت) |
| ئێمە دە خەوت (ین) | ئێمە دە (مان) نووس (ن) |
| ئێوە دە خەوت (ن) | ئێوە دە (تان) نووس (ین) |
| ئەوان دە خەوت (ن) | ئەوان دە (یان) نووس (ن) |

نەخشەی (٤/٤): سیستمی (ئیرگەیتیڤ) لە رابردوودا.

Minara Printing Press
چاپخانەی منارە — هەولێر
0750 445 6297
0770 445 6297
مطبعة منارة - اربيل